# کێش و ڕیتمی شیعری فۆلکلۆری کوردی



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی



زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی خانزاد، هەولێر

س. پ. ژمارە: ١

www.araspublisher.com

# کێش و ڕیتمی شیعری فۆلکلۆری کوردی

## د. محەمەد بەکر



ناوی کتێب: کێش و ڕیتمی شیعری فۆلکلۆری کوردی
دانانی: د. محەمەد بەکر
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٢٩٤
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: نسار عەبدوڵڵا
هەڵەگری: دڵشاد مستەفا + هندرێن شێرزاد
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم – چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر– ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٩٩)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ.

# نێوەڕۆک

## پێش باس

پێ–١ پرسیارە بێ وەڵامەکان
پێ–٢ سەرچاوەکانی پۆلینکردنی کێشی خۆماڵی
پێ–٣ وێنەکانی شیعری فۆلکلۆری کوردی

**بێ-١ پرسیارە بێ وەڵامەکان:**

لاپەڕەکانی ڕەخنەی کوردی لە بواری کێشی خۆماڵیدا، گەلێ نیشانەی پرسیاریان پێوەیە، بەڵام ڕەنگە گرنگترینیان ئەمەی خوارەوە بێت:

«ئایا ژمارەی برگەکانی دێڕی شیعرێک، بەتەنیا دەتوانێت ئاستە ڕیتمی و سیمانتی و سینتاکسییەکانی شیعرەکە دیاری بکات؟»، ئەمە ئەو پرسیارە مەڵبەندییە بوو کە دەبوایە لە یەکێک لە پێچەکانی ڕێڕەوی شیعری نوێی کوردیدا ئاراستە و وەکو ئەرکێکی دوا نەخراو یەکلایی بکرایەتەوە.

(شێخ نووری شێخ ساڵح) لە پاشەکیی دەسنووسی (سەنعەت و سەنایعی نەفیسە)دا نووسیبووی: «ڕاستی بەلێکۆڵینەوە ئەدۆزرێتەوە، برووسکەی ڕاستی لە لەیەکدانی ئەفکارەوە پەیدا ئەبێ»(١)، بەڵام نە خۆی و نە پاشانیش (گۆران)، لە گەرمەی ئەو تاقیکردنەوە پیرۆزانەی بۆ بەرژەوەندیی شیعری کوردی لە ئەستۆیان گرتبوو، ماوە و کەرەسەی ئەرکێکی تیۆریی لەو بابەتەیان لەبەردەستدا نەبوو. کارەکانی پاشتریش، لەبەرئەوەی پۆلینکردنی کێشی خۆماڵی وەکو کێشێکی رووتی برگەیی تا پلەی مەیین قاڵبی گرتبوو، پێشەکی دۆخی ئەو بەستەڵەکە سستی دەکردن.

لەلایەکی دیکەوە، هەر هەوڵدانێکی ڕچەشکێن بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکەی پێشوو، دەبوایە بەرەنگاری پرسیارێکی دیکە لە بارەی جیاکردنەوەی ئاستە تیۆرییەکانی (کێش: الوزن) و (ڕیتم: الایقاع) بوایە، کە ئالۆزیی لەوەی یەکەم کەمتر نەبوو.

ئاراستە نەکردنی ئەو پرسیارانە لە سەرەتای قۆناغی تازەکردنەوەی شیعری کوردیدا، دەرگای زاراوە گواستنەوەیەکی میکانیکیی بۆ کێشی خۆماڵی خستەسەر پشت کە دوور لە ئەدگارەکانی زمانەکەی دارێژرابوو. بەڵام ڕەخنەی تازە پشکووتووی کوردی، بۆ وەدەستهێنانی ڕەنگ و



بۆیەکی تایبەتی، ئامادە بوو پێشوازی لە هەر تاقیکردنەوەیەکی جیا لە نموونە باوە عەرووزییەکە بکات.

لەم قۆناغەشدا، کە پێشکەوتنە هەمەلایەنەکانی زانیاریی هاوچەرخ هەلی پۆلینکردنەوە و دەستنیشانکردنی بنیاتی ڕیتمی کێشی خۆماڵیی ڕێکخستووە، وێنەیەکی فرە ڕەنگتری پرسیارەکانی پێشوو لەسەر تابلۆی ڕەخنەی تازەی شیعری کوردیدا چاوەڕێی وەڵامدانەوەن:

- شیعری فۆلکلۆری کوردی، چ بنیاتێکی ڕیتمیی هەیە؟
- لە بواری شیعری فۆلکلۆریدا، چەند جۆرە سیستێمی (کێش) هەیە؟
- جۆرە بێ کێشەکانی شیعری فۆلکلۆری (حەیران، لاوک) یەک سیستێمی ڕیتمییان هەیە، یان جیاوازن؟
- چۆن دەستە دەنگییەکانی شیعری کێشراوی فۆلکلۆری (بەیت، گۆرانی)، جیا دەکرێنەوە و سیستێمی ڕیتمییان دیاری دەکرێت؟
- (چەندێتی و چۆنێتی)ی برگە لە کێشی خۆماڵیدا، چ ڕۆڵێکی ڕیتمی دەگێڕن؟
- (یەکەی کێش) و (یەکەی ڕیتم) لە شیعری فۆلکلۆریدا چین؟ هەر لەم ڕوانگەیەشەوە، ئایا (هەنگاو - پێ) لە شیعری کێشراوی فۆلکلۆریدا هەیە؟

هەوڵدانی نزیکبوونەوە لە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە و گەلێکی دیکەی لەو چەشنە، دەتوانێت ئەو سادەگەرییە لەسەر شیکردنەوەکانی کێشی خۆماڵی لابدات کە پەنجە و (کۆمپیوتەر) لە یەک ئاستدا ڕادەگرێت.

جارێکی دیکە، بۆ لابردنی هەر تێبینییەکی دوور لە مەبەست، لە جێی خۆی دایە بابەتە سەرەکییەکە لە ڕوانگەی ڕاستییەکەوە دووپات بکرێتەوە کە لەم بوارەدا شتێکی تازە نییە: شیعری هەر نەتەوەیەک، ئەدگارە سەرەکییەکانی زمانەکەی دیاریی دەکەن: ئێمە زمان و کێشی

خۆماڵیمان هەیە، کەواتە ئەدگار و دەستووری خۆماڵیشمان هەیە.

بۆیە، ئەو یەکێتییە تەواو عەیارەی لە پۆلینکردنی کێشی خۆماڵیدا ڕەگی پتەو کرد و پەلی لێ بۆوە، پێش ئەوەی بەڵگەی ڕاستیی بۆچوونەکان بێت، سستی و یەک شێوەیی لێکۆڵینەوەکان و پشتگوێ خستنی سەرسوڕهێنەری ئەدگارەکانی زمانی کوردیی بەرجەستە کردووە.

پێ-١-١ پۆلینکردنی کێشی خۆماڵی وەکو کێشێکی ڕووتی بڕگەیی، لە تیۆری و پراکتیکدا گەلێ ئەنجامی زیانباری لێ بۆتەوە. لە تیۆریدا، لەو پێناسانەی کێشی خۆماڵیدا دەردەکەون کە هەرچەندە بەڕواڵەت هاوژمارەیی بڕگەکان یەکیان دەخات، بەڵام لە ڕاستیدا هەریەکەیان سیستێمێکی ڕیتمیی جیاوازی شیعری جیهانی دەنوێنن.

ڕوویەکی دیکەی پۆلینکردنی نادروستی کێشی خۆماڵی، لەو دابەشکردنە جیاوازانەدا بەرچاو دەکەوێت لە بارەی جۆر و بابەتەکانی شیعری فۆلکلۆرییەوە ئەنجام دراون. لەم بوارەدا شیعری خودی: (لیریک). لەگەڵ چیرۆکی شیعری: (ئیپیک)دا ئاوێتەکراون، لە ئەنجامیشدا خانەی شیعرە بێ کێشەکان لەگەڵ کێشراوەکاندا بەئەندازەیەک سنووریان کاڵ بۆتەوە، نەتوانرێت بەئاسانی باس لە سیستێمە جیاواز ەکانیان بکرێت.

ڕەخنەی کوردی لە پراکتیکدا وا هەست دەکات تەنیا لە ڕێگای بزواندنی پەنجەکانەوە ڕەسەنایەتی بەکێشی خۆماڵی دەبەخشێت، لە ڕاستیدا پتر جڵەوی بۆ شل دەکات. ئەدگارە دینامییەکانی خۆی هەروا بەداپۆشراوی بهێڵێتەوە و سنوورەکانی لەگەڵ سیستێمە ڕیتمییەکانی دیکەدا ون بکات.



**پێ-٢ سەرچاوەکانی پۆلینکردنی کێشی خۆماڵی:**

سەرەتایەکی مێژوویی: پۆلینکردنی کێشی خۆماڵی، هاوکات لەگەڵ قۆناغی دووەمی گواستنەوەی شیعری کوردیدا ئەنجام درا: قۆناغی ڕوو وەرگێڕان لە مەبەستە مەنگەکانی شیعری کلاسی و ئاوڕدانەوە لە ئالای شیعری (تورکی)، کە لە نیوەڕاستی سەدەی (١٩)وە بەدەست شاعیرانی وەکو (نامیق کەمال) و (ئەحمەد مدحەت)ەوە خەریکبوو بەشنە (فەرەنسی)یەکانی ڕێبازی ڕۆمانتیکی دەشەکایەوە[٢].

عەرووزی کوردی، لە ڕاستیدا، هەر لە سەردەمی (ئەحمەدی خانی)یەوە (١٦٥٠-١٧٠٦) هەلی بۆ ڕێککەوتبوو نیوەڕۆکی خۆی - لەگەڵیشیدا ڕوخساری - بگۆڕێت، بەڵام هەستی ڕووتی نەتەوایەتی، بێ تاقیکردنەوەیەکی هەمەلایەنەی جیاوازی شیعری، بواری نەدەدا بەها ستاتیکییەکانی (سەعدی) و (حافز) و سیستێمە ئەندازەییەکەی (خەلیل)، کە (حوجرە) بەتوندی بەرگریی لێ دەکردن، جێگای خۆیان بۆ شەقڵێکی خۆماڵی چۆڵ بکەن. تەنانەت شاعیرێکی نزیکتری وەکو (حاجی قادری کۆیی)ش (١٨١٥-١٨٩٧)، کە زۆربەی مەبەستە نەتەوەییەکانی لە قاڵبی شیعری (١٠) بڕگەییدا دادەڕشت و پێدەچوو ئەو هەوڵەی ڕەنگدانەوەی هەست پێکردنێکی بەئاگای فۆلکلۆری کوردی بێت، لە یەکەمین شیتەڵکردنەوەی عەرووزیدا - هەروەکو (مەم و زین)ەکەی (خانی) - خۆیان بەدەست کێشی (هەزەج)ی شەش هەنگاویی (ئەخرەبی مەقبووزی مەحزووف، یان مەقسوور)ەوە دەدەن، ژمارەیەکیشیان لە خانەی (خەفیف)ی شەش هەنگاویی (مەخبوونی مەحزووف، یان ئەسڵەم)دا شێوە دەگرن.

کەواتە کێشی خۆماڵی، دەبوایە نزیکەی (٢٥٠) ساڵ چاوەڕێ بکات تا لەگەڵ داهاتنی سەدەی بیستەمدا، سیماکانی لە چەند سروودێکی (زێوەر) و (بێخود)دا گەلاڵە بن و سەرەنجام لە تاقیکردنەوە گەشەکردووەکانی (پیرەمێرد) و (شێخ نووری)دا ڕوونتر بنەوە.

بەو شێوەیە، کاتێ (گۆران) لە سەرەتای پەنجاکاندا بڕیاری دا بەیەکجاری واز لە بەکارهێنانی کێشە عەرووزییەکان بهێنێت، تاقیکردنەوە پێگەیشتووەکانی توانایان پێ بەخشیبوو پەردە لەسەر قۆناغی سێیەمی بزووتنەوەکە هەڵداتەوە و بنیاتی شیعری هاوچەرخی کوردی لەسەر بنچینەی نیوەڕۆکێکی جیهانیتر و ڕوخسارێکی خۆماڵیتردا دامەزرێنێت[٣].

بەوەش، کێشی خۆماڵی توانیی هەموو قاوغە ناوچەییەکان تێک بشکێنێت و نەخشەیەکی نوێ، بەفراوانیی شیعری هاوچەرخی کوردی داڕێژێت.

بەڵام ئەو دەستکەوتە گرنگە، کە پتر لە ئاستی پراکتیکدا خۆی دەنواند، لە توانایدا نەبوو هاوڕێی پەرەپێدانێکی تیۆریی هاوتەریب بێت، ئەمەش لە تاقیکردنەوە شیعرییەکانی پاشتردا ڕێگای بۆ گەلێ بۆچوونی تیۆری و هەوڵدانی هونەریی جیاواز خۆشکرد کە شیعرەکەیان لە سروشتی ڕەسەنی خۆماڵی دەرهێنا و لە چەند سیستمێکی شیعریی جیاواز -بەتایبەتی عەرووز- نزیکیان کردەوە.

پێ-٢-١ شێخ نووری و ئەدەبیاتی تورکی:

ڕێبازی (فەجری ئاتی)، کە لە ڕەخنەی کوردیدا بەسەرچاوەیەکی گرنگی ئەو بزووتنەوە ئەدەبییە دادەنرێت «م. نووری و هاوڕێکانی لە ئەدیبە تازەکانی تورکی عوسمانییان وەرگرت و لە سەردەمێکی سنووردارا (١٩٢٠- ١٩٣٠) شیعری کوردی ناوچەی سلێمانییان پێ تازەکردەوە»[٤]، نزیکەی (١٢) ساڵ بەر لە سەرەتای ئەو مێژووەی (گۆران) دەستنیشانی کردووە، وەکو ڕێبازێکی سەربەخۆ لە ئارادا نەمابوو، لەوەش دەچێت هەڵگەڕانەوە لە عەرووز و ئاوڕدانەوەی تەواو لە (هجەوزنی)، ئەدگاری سەرەکیی ئەو ڕێبازە تەمەن کورتە (١٩٠١- ١٩٠٨) نەبووبێت.



ئامانجی ئەو ڕێبازە، وەکو (بەندەر ئۆغلۆ) ڕوونی دەکاتەوە، پتر لە گەشەپێدانی زمان و ئەدەبیاتی تورکیدا دەردەکەوت، ڕێبازی هێماگەریی (فەرەنسی)ش یەکێک لە ئەدگارەکانی بووە[٥].

زۆربەی شاعیرانی ئەو ڕێبازە، چەشنی (تەوفیق فیکرەت) و (جەلال ساهیر)، هەمان نوێنەرانی ڕێبازی (سەروەتی فنوون) بوون کە (ڕەجائی زادە ئەکرەم) سەرپەرشتی دەکردن. ئەمانیش، هەرچەندە شێوە و ناوەڕۆکی شیعری تورکییان تازەکردەوە، بەڵام شێوازە کۆنەکەیان هەر پاراست کە پشتی بەکێشە عەرووزییە ئاوێتەکراوەکانی وشە عەرەبی و فارسییەکان دەبەست[٦].

هەرچەند ئەدگارە سەرەکییەکانی ئەو ڕێبازە، لەگەڵ سیما گشتییەکانی تاقیکردنەوە شیعرییەکەی (شێخ نووری)دا ڕێک دەکەون، لەگەڵ ئەوەشدا ناگەنە پلەی هەندێ لە شیعرەکانی کە لە ڕوخسار و ناوەڕۆکیشدا شەقڵێکی تازەتر و بنچینەیەکی هاوچەرخانەتریان هەیە. ڕەنگە ئاوڕدانەوە لە ڕێبازی دووەمی ئەدەبی تازەی تورکی، بۆ دۆزینەوەی سەرچاوە ڕاستەوخۆکەی پۆلینکردنی کێشی خۆماڵی بەکەڵکتر بێت.

ڕێبازی (ئەدەبی میللی)، کە یەکسەر پاش توانەوەی ڕێبازی (فەجری ئاتی) سەری هەڵدا، دەتوانێت بەوردی ئەو مەبەستانە ڕوون بکاتەوە کە پرۆسێسی بزووتنەوەی گواستنەوەی شیعری کوردی دەری بڕیبوون.

ئەم ڕێبازە لە ماوەی (١٥) ساڵی تەمەنیدا (١٩٠٨-١٩٢٣) کۆششی سەرەکیی ئاراستەی بژارکردنی زمانی تورکی لە وشە و دەربڕینە بیانییەکان و بایەخدان بەبابەتی تورکی و وازهێنان لە عەرووز و ئاوڕدانەوە لە کێشی بڕگەیی کردبوو[٧].

کەواتە ئەو دوو کۆڵەکەیەی بزووتنەوە کوردییەکەیان لەسەر بنیات نرابوو - نیوەڕۆکی نیشتمانپەروەری و ڕوخساری خۆماڵی - دوو ئەدگاری هەرە دیاری ئەم ڕێبازە بوون. تەنانەت (نامق کەمال) بەتوندی

ڕایگەیاندبوو: دارشتنی بابەتە تورکییەکان لە قاڵبی عەروزدا مەحاڵە[٨].

بایەخدان بەم لایەنە بەڕادەیەک گەیشتبوو کۆمەڵێک لە شاعیرانی ئەم ڕێبازە بەناوی (پێنج شاعیرە برگەییەکە)ەوە ناسراوبوون[٩].

ئەوە فەزای ساڵانی پێش بیستەکان بوو، کە (شێخ نووری) خەریکی گواستنەوەی بۆ شیعری کوردی بوو، فەزایەکی واش - وەکو (گۆران) پاشتر ڕوونی دەکاتەوە - سروشتی بوو سەرنجی ڕووناکبیرە کوردەکانی ناو سنووری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ڕاکێشێت و ئەمانیش هەوڵ بدەن ئاوڕ لە کێشی نەتەوایەتیی خۆیان بدەنەوە[١٠].

بەو جۆرە، (شێخ نووری) لە ڕێگای هەردوو ڕێبازەکەی ئەدەبی تازەی تورکییەوە، زاراوەی (هجەوزنی)ی پاش و پێش کرد و وێڕای بنەڕەتییەکانی دیکەی ئەو دوو ڕێبازە، بۆ شیعر و ڕەخنەی کوردی گواستنەوە، بزووتنەوەی نەتەوایەتیی ئەو سەردەمەش، وەکو هۆکارێکی ناڕاستەوخۆ، پشکۆکانی ئەو پرۆسیسەی دەگەشانەوە.

لێرەوە، کاتێ سەرنجی ڕوونکردنەوەکانی (شێخ نووری) لە چوارچێوەی پێناسەکردنی کێشی شیعردا دەدەین، دەبینین دەربڕینێک بەکار دەهێنێت. پتر لە نووسینە تورکییەکاندا باوە. بەنموونە، لێکدانەوەیەکی وەکو «وەزن لە ئاهەنگی ئەسوات و ئەسواتیش لە حورووفی سەدا دار مورەککەبە»[١١]. هەمان بنچینەی پۆلینکردن بەکاردەهێنێت کە دەنگە (ئاوازەدار) و (کپ)ەکانی (هجەوزنی)ی تورکییان لەسەر جیاکراونەتەوە[١٢]. بەمەش، هیچ بەربەستێک لەبەردەم (شێخ نووری)دا نەمابوو، بۆ ئەوەی ژمارەی ڕووتی برگەکان بکات بەتاکە پێوەرێکی کێشی خۆماڵی و لە بارەی دێڕە شیعرێکی فۆلکلۆرییەوە ڕاگەیەنێت: «لە گۆرانیی کوردیدا بەعزێ ئەشعاری موتەداوەلە موافیقی وەزنی هیجائییە (...) عەدەدی هیجای ئەم سیسرەعە ئەگەر بژمێری ئەزانی کە عەدەدی هیجاکانی (١٦)یە»[١٣].



**پێ-٢-٢ گۆران و... کێشی خۆماڵی:**

کێشی خۆماڵی لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا، بەڕەوتی پرشنگداری (گۆران)ەوە پەیوەستە، کە لەبەکارهێنانەکانیدا چەند زاراوەیەکی وەکو «خونجە - پەنجە - هیجا - مەقتەع»ی بۆ دەستنیشان کردووە[١٤]. ئەو، لە تیۆری و پراکتیکیشدا، بابەت و جۆرەکانی شیعر و کێشی خۆماڵیی بەهەنگاوی فراوان بەرەو پێش برد، بەڵام بایەخدانی سەرەکیی بەتاقیکردنەوە هونەرییەکان، لێکۆڵینەوەکانی لە بارەی پۆلینکردنی کێشەکەدا تووشی سادەگەرییەکی بەرچاو کرد، کە لەگەڵ پلەی هونەریی تاقیکردنەوەکانیدا بەراورد ناکرێن، لەگەڵ ئەوەشدا بایەخی خۆیان هەر پاراستووە.

بارودۆخی نوێ یارمەتیی (گۆران)یان دا لە ئاستێکی فراوانترەوە پۆلینکردنەکەی (شێخ نووری) بچەسپێنێت، لەو ئەرکەشیدا سەرنجی دوو دیاردەی دابوو بۆ مەبەستەکانی گەلێ بەسوود بوون:

(یەکەم) بۆچوونی هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسەکان سەرنجیان ڕاکێشا بۆ ئەوەی لە نموونەیەکی زۆر دوورتر لە شیعری تورکی بڕوانێت: نموونەی کێشی (گاتا)کانی (ئاڤێستا) و شیعرەکانی زمانی (پەهلەوی).

لە زنجیرە وتاری (ئاوڕێک بەرەو مێژوو)دا (گۆران) پشت بەکتێبە پڕ لە زانیارییەکەی (خانلەری)، ئاماژە بۆ پۆلینکردنی کێشی (ئاڤێستا)یی لە ڕوانگەی چەند شارەزایەکەوە دەکات کە لەسەر بنەڕەتی هەمان ژمارەی برگە لە نیوە دێڕەکاندا دامەزراوە، شوێنی وەستانەکانیش جێگیر نەبووە[١٥].

یەکێک لەو شارەزایانەی (گۆران) ئاماژەی بۆ کردوون، لە ڕاستیشدا کۆڵەکەی سەرەکیی بۆچوونەکەیە، (بەنڤینیست)ی ڕۆژهەڵاتناسی (فەرەنسی)یە. بەگوێرەی بۆچوونی ئەو ڕۆژهەڵاتناسە، شیعرەکانی (ئاڤێستا) و (پەهلەوی) لەسەر بنچینەی هاوژمارەیی برگەکان

دامەزراون و «چەندی» و «چۆنی»ی بڕگەکان لەواندا بایەخیان نییە. پاشان (گۆران) وێڕای ڕەتکردنەوەی بۆچوونێکی (بەنڤینیست) لە بارەی لکاندنی زمانی کوردی، وەکو شێوەزارێک، بەزمانی (پەهلەوی)یەوە، بۆچوونەکەی لە بارەی ئەوەی: «کێشی هەڵبەستی کوردی، لە جۆری بڕگەییە و ژمێرە - حیسابی - درێژی و کورتی بڕگە، هیچ پەیوەندییەکی بەسەرەوە نییە» دەسەلمێنێت[١٦].

(دووەم) (گۆران) لە چاوگێڕانیدا بەدوای نموونەیەکی ناعەرووزیدا، بۆ ئەوەی ئاستێکی پراکتیکی بەبۆچوونەکەی (بەنڤینیست) ببەخشێت و یارمەتیی شیکردنەوەی چەند نموونەیەکی کێشی خۆماڵیی لێ بخوازێت، لە نموونەی شیعری (فەرەنسی) لەبارتری پەسەند نەکرد کە لە ئاستی جیهانیشدا بە«شیعرێکی نە چەندی و نە سترێسی» ناسراوە[١٧].

بۆ ئەوەی تێگەیشتنێکی چاکتر لە بارەی بۆچوونەکانی (گۆران)ەوە لەم بوارەدا بەدەست بهێنین، پێویستە سەرنجی (موحازەرە)کانی بەشی کوردیی کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای بدەین، کە تیایاندا وێنەیەکی زۆر نزیکی شیعری (فەرەنسی)ی بۆ دێڕە شیعرێکی (مەولەوی) کێشاوە.

(گۆران) لە سەرەتایەکی تیۆریی زۆر دروستەوە دەست بەشیکردنەوەکانی خۆی دەکات و ڕوونی دەکاتەوە جۆری کێش لە شیعری زمانێکدا، ئەدگارەکانی ئەو زمانە دەستنیشانی دەکەن. لێرەوە ئاماژە بۆ چەند کێشێکی جیهانی دەکات کە چۆن ئەو ئەدگارانە «مۆسیقای» شیعرەکەیان دارشتووە. بەنموونە، شیعری (گریکی) و (لاتینی) لەسەر بنچینەی (چەندێتی)ی بڕگە کورت و درێژەکان و شیعری (ئینگلیزی) لەسەر (چۆنیەتی)ی بڕگە سووک و قورسەکان دامەزراون. بەڵام زمانێکی وەکو (فەرەنسی)، کە نە (چەندێتی) و نە (چۆنێتی)ی بڕگەکان بەشێکن لە ئەدگارەکانی، ئەوا کێشی شیعرەکەی «ترپەدار: ایقاعی» نییە و دابینکردنی مۆسیقاکەی «لەنگەر»ێکی دەنگ لە کۆتایی هەر «پێ» و دوا بڕگەی دێڕەکاندا دەری دەخات کە لەگەڵ (سترێسدا) جیاوازیی هەیە[١٨].

شیکردنەوەکانی پێشوو، (گۆران) بەئەنجامێک دەگەیەنن بۆ پێناسەکردنی کێشی خۆماڵی - بەڵام بێ ئەوەی ئاماژە بۆ ئەدگارەکانی زمانی کوردی بکات - نموونەی کێشی (فەرەنسی) هەڵبژێرێت و بڕیار بدات کێشی خۆماڵی «لەسەر بنەڕەتی ژمارەی بڕگە ئەڕوا لە هەر (پێ)یەی دێڕەکانی هەڵبەستدا، بەوێنەی کێشی فەرەنسی»[١٩]. پاش ئەو پێشەکییە تیۆرییە، (گۆران) نموونەیەک لە دێڕە شیعرێکی (مەولەوی) دەهێنێتەوە و پێوەرەکانی شیعری (فەرەنسی)یان بەسەردا دەسەپێنێت. نموونەکە دێڕە شیعرێکی (١٠) بڕگەییە، لەبەرئەوە بەسەر (٤) هەنگاوی (٥) بڕگەییدا دابەشی دەکات و (لەنگەر)ێکی قورسایی دەخاتە سەر دوابەشی هەر هەنگاوێک، پاشان سەرنجی (چەندێتی)ی بڕگەکان دەدات و ڕوونی دەکاتەوە کورتی و درێژی بڕگەکان لە «پێ»یەکاندا هیچ جۆرە ژمێرەیەکیان بۆ ڕانەگیراوە. پاشان ئەو ئەنجامەی پێشوو فراوان دەکاتەوە تا ئەو دوای کێشەکانی فۆلکلۆریش بگرێتەوە کە هەرە باویان دوای کێشی (١٠) بڕگەیی، هەشتی (٤+٤) و حەوتی (٤+٣) بڕگەیین. پێش ئەوەی دوایی بەو شیکردنەوانەی بهێنێت، ئاماژەیەکی زۆر گرنگ بۆ «کێشی» حەیران و لاوک دەکات و بەلایەوە دوورنییە «لەنگەر» - لێرەدا مەبەستی لە سترێسە - لە دروستکردنی «مۆسیقا»یاندا ڕۆڵێکی هەبێت[٢٠].

پێ - ٢-٣ پێداچوونەوەی هەندێ بۆچوونی دیکە:

هاوکات لەگەڵ ئەو جموجۆڵەی (گۆران)دا، پرۆژەی کتێبێکی سەربەخۆ لەم بوارەدا لە دۆخی گەڵاڵەبووندا بوو، لە ڕاستیشدا ئەو وتار و گفتوگۆ ڕەخنەییانەی لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری (شەفەق)دا ڕەنگیان دابۆوە، ڕێگایان بۆ دەرچوونی کتێبی (کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا) خۆش کرد.

ئەو کتێبەی (د. خەزنەدار)، کە پەرەپێدانی بۆچوونەکانی (شەفەق)ە، گەلێ پرسیاری گرنگی لە بارەی لایەنەکانی کێشی خۆماڵییەوە وروژاندووە، ئەگەر بهاتایە و پاشتر بەوردی ئاوڕیان لێ بدرایەتەوە، لێکۆڵینەوەکان لەو لایەنانەوە قۆناغێکی بابەتیانەتریان دەبڕی.

هەرچەندە (د. خەزنەدار) لە هیچ جێگایەکی کتێبەکەیدا هەوڵی پێناسەکردنی کێشی خۆماڵیی نەداوە (ڕەنگە ئەمە پێشبینی نووسەرێکی دووربین بێت کە لە ڕاستیی پۆلینکردنە باوەکەی کێشی خۆماڵی دڵنیا نەبووە)، بەڵام دەتوانین لە پەنای بابەتەکاندا هەست بەتارماییەکی ئەو کێشە بکەین.

(د. خەزنەدار)، وەکو (یەکە)ی سەربەخۆ لە بڕگەی کێشی خۆماڵی دەڕوانێت. بەگوێرەی ئەو بۆچوونە، کێشی خۆماڵی لە ژمارەیەکی چوونیەکی بڕگەی هاوکات پێکدێت. بەدەربڕینێکی سادەتر، بڕگەکانی دێڕە شیعرێکی فۆلکلۆری لە کاتی خوێندنەوەدا کاتیان بەرامبەر دەبێت، بەزۆریش بڕگە درێژەکان لە بڕگە کورتەکان نزیک دەبنەوە[٢١].

پێ-٢-٤ بەرامبەر بەو تێڕوانینە، دەستەیەکی دیکە لە بۆچوونەکان، وەکو (تەفعیلە)ی عەرووزی لە (هەنگاو)ی کێشی خۆماڵی دەڕوانن. ڕەنگە ئەو زاراوانەی (عەلائەدین سەجادی) بۆ پێناسەکردنی کێشی خۆماڵی بەکاری هێناون: ٠پیتی دەنگدار و بێ دەنگ، یا جوڵاو و نەجووڵاو)[٢٢]، یان پێناسەکردنەکەی (ئەحمەد هەردی) بۆ کێشی «پەنجە»: (هەمان ژمارەی بڕگە لە هەنگاوەکاندا)[٢٣]، بۆ دیاریکردنی بۆچوونەکانی ئەم دەستەیە بەڵگەی لەباربن، بەڵام شیکردنەوەکانی (کامیل ژیر) نموونەیەکی ڕوونتر پێشکەش دەکەن.

بەلای (ژیر)ەوە «مۆسیقا و ئاواز»ی شیعر، سەرجەمی بڕگەکانی ناو هەنگاوەکان دروستی دەکەن، نەکو بڕگە کورت و درێژەکان بەتەنیا، بەڵام لەبەرئەوەی لە کێشی خۆماڵیدا هەموو بڕگەکانی ناو هەنگاوەکان لە



کورتی و درێژیدا وەکو یەکتر نین، «مۆسیقا»ی شیعرەکەش بەلای ئەوەوە کاتێ دروست دەبێت ئەگەر بڕگەکان وێڕای یەکێتیی ژمارەیان، چەندێتیشیان وەکو یەکتر بێت، ئەوا لێکدانەوەیەک بۆ چارەسەرکردنی ئەو ناکۆکییە پێشکەش دەکات کە بریتییە لە کورتبوونەوە و درێژبوونەوەی بڕگەکان لە کاتی خوێندنەوەدا، بۆ ئەوەی هەنگاوەکان وەکو یەکتریان لێ بێتەوە[٢٤].

**پێ-٣ وێنەکانی شیعری فۆلکلۆری کوردی:**

زۆربەی باس و لێکۆڵینەوەکان، لە ڕوانگەی (گۆرانی)یەوە لە جۆرەکانی شیعری فۆلکلۆری دەڕوانن.

لە وتارێکدا بەناونیشانی (فۆلکلۆری کوردی لە ڕوانگەی زانا و ڕۆژهەڵاتناسان و نووسەرانی کورددەوە)، کە پتر شەقڵێکی بیبلۆگرافیای هەیە. (عومەر ئیبراهیم عەزیز) زۆربەی ئەو بۆچوونانەی تۆمار کردووە دوور یا نزیک ئاماژەیان بۆ ئەو سامانە بەنرخە کردووە. بەشێکی زۆریشیان، هەر لە (ئابۆڤیان)ەوە کە باسی «گیانی شاعیرانە» و «توانای گۆرانی بێژ»ی کورد دەکات، تا (نیکیتین) و (مار) و (ئۆسکارمان) و ئەوانی دیکە، ئاشکرا شیعر و گۆرانییان پێکەوە لکاندووە، نووسەرانی کوردیش، کە لە هەمان وتاردا ئاوڕ لە بەرهەمی گەلێکیان دراوەتەوە، بەهەمان شێوە هاوکێشەی (شیعر - گۆرانی)یان پاراستووە[٢٥].

ڕەنگە ڕوونترین نموونە بۆ بەرجەستەکردنی ئەو بۆچوونە، وتارەکەی پرۆفیسۆر (حاجی جندی) بێت: (کلامێد جمعه تا کوردایە لیریکی یێ) کە، پاشتر (عوسمان شارباژێڕی) لە (گەنجینەی گۆرانی کوردی)دا بەفراوانی دەیچەسپێنێت.

(جندی) لەو وتارەیدا شیعرە فۆلکلۆرییەکان لەسەر بنچینەی سێ جۆری گۆرانی: (کارکردن، ئەویناری، سروشت)دا پۆلین دەکات، لەو

کارەشیدا چەندین نموونەی شیعری گۆرانی و لاوکی لە سنووری هەمان پۆلینکردندا ڕیزکردوون، کە لە ڕاستیدا سەر بەچەند سیستێمێکی ڕیتمیی جیاوازن. ئەمەش وای لێکردووە لەنێو هەموو ئاستە هونەرییەکانی شیعرەکاندا، تەنیا ئاوڕ لە سیستێمی (قافیە)کان بداتەوە[٢٦].

پێ-٣-١: بەرامبەر بەو پۆلینکردنە مۆسیقاییە، پۆلینکردنێکی دیکە هەیە لەسەر بنچینەیەکی تەواو (بابەت)ی، جۆرەکانی شیعری فۆلکلۆری دابەش دەکات. بەگوێرەی دابەشکردنەکەی (د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ)، هەموو جۆرەکانی (بەیت) دەچنە خانەی (داستان)ەوە، کە دوو جۆری هەیە:

(ئەلف) داستانی قارەمانێتی: وەکو (بەیت)ەکانی (سوارۆ، شەریف هەمەوەند، خانزاد و لەشکری... هتد).

(بێ) داستانی ئەڤین و دڵداری: وەکو (بەیت)ەکانی (زەمبیل فرۆش، خەج و سیامەند).

هەموو ئەو شیعرە (٨، ١٠) بڕگەییانەش لە «تاڤە دێڕێک یا بەیتێک هۆنراو» پێکهاتوون، ئەوا لەو شیعرە فۆلکلۆرییانەن کە «لە ڕووی ئەدەبیاتەوە (مۆسیقا نا) دەتوانین (...) بەجۆرە شتێکی جیا لە بەیت و داستان» دایانبنێین[٢٧].

پێ-٣-٢: دەتوانین پۆلینکردنەکەی (د. محەمەد موکری) لە کتێبی (گۆرانی یاترانەهای کوردی)دا، کە بەشێوەیەکی شایستە لە لێکۆڵینەوە فۆلکلۆرییەکاندا بڕوای لەسەرە، بەهەنگاوێکی سەرەتایی دروست بژمێرین کە تاڕادەیەک هاوسەنگیی نێوان (بابەت) و ڕوخساری مۆسیقایی جۆرەکانی شیعری فۆلکلۆریی ڕەچاو کردووە.

(د. موکری) شیعری فۆلکلۆری کوردی بەسەر دوو دەستەدا دابەش دەکات:



(ئەلف) بەیت: (لاوک) و (حەیران) وەکو دوو وێنەی ژانری (بەیت) دیاری کراون، (بەیت)یش ئەو «پەخشانە کێشراو و شیعرانەن کە بابەتێکی وەسفی، یان مێژووییان هەیە»، هەرچی شیعرە (٨، ١٠) بڕگەییەکانیشن، کە بەشی زۆری قەوارەی کتێبەکەیان پێکهێناوە بەشیعری «گۆرانی» داینراون[٢٨].

پێ-٣-٣: ئەو پۆلینکردنەی (د. موکری)، پاشتر گەلێ گۆڕانی بابەتیانەی بەسەردا هات. ئەگەر سەرنجی ڕەوتی ئەدەبیی نووسەرێکی وەکو (د. خەزنەدار) بدەین، هەر لە یەکەمین نووسینی لەم بارەیەوە لە گۆڤاری (شەفەق)دا، تا دوا بەرهەمی وەرگێڕاوی لە گۆڤاری (کاروان)دا، کە (٣٠) ساڵ پتری خایاندووە (١٩٥٨-١٩٨٩)، سروشتی پەیژەیی ئەو گۆڕانە بەوردی دەبینین.

لەو بەرگرییە سەرکەوتووەیدا کە لە «ئسلوبی تایبەتیی نەتەوەی کورد لە شیعردا» دەیکات، (د. خەزنەدار) پۆلینکردنێکی زۆر نزیک لەوەی (د. موکری) بۆ شیعری فۆلکلۆری دەکات و پشت بەکێشی (ئاتا)کانی (ئاڤێستا)، هەر جۆرە کارتێکردنێکی «عەرووز» و «وەزنی ڕۆژئاوایی»یان لێ دوور دەخاتەوە[٢٩].

لە ساڵی (١٩٦٢)دا، پۆلینکردنەکە لەلایەن (د. خەزنەدار)ەوە تووشی ڕێکخستنێکی بەجێ دەبێت، کە ڕەچاوکردنی پتری نێوەڕۆک، دیارترین سیمایەتی:

(ئەلف) گۆرانی: شیعرە (٧، ٨، ١٠) بڕگەییەکان دەگرێتەوە.

(بێ) بەیت: لە بابەت کێشەوە وەکو گۆرانییەکانن، بەڵام ئەم بیرێکی درێژە (چیرۆکی قارەمانی، دڵداری) دەخرێتە ناو قاڵبی شیعرەوە.

(تێ) حەیران - لاوک: کە «هونەرێکی شەعبی نەتەوەی کوردە، لەلایەن کێش و قافیەوە لە بەیت سەربەستترە» بۆیە (د. خەزنەدار) هەوڵ دەدات ئەو سەربەستییە لە ڕێگای شێوەی وتنی بێژەرەکانەوە سنووردارتر پیشان بدات[٣٠].

هەر لەلایەن (د. خەزنەدار) خۆیەوە، جارێکی دیکە دەسکاریی پۆلینکردنەکە دەکرێت، بەڵام لە زنجیرەی جۆرەکاندا نەکو لە بنیاتەکانیاندا، کە لەم دابەشبوونەی خوارەوەدا ڕیز دەبەستن[31]:

(یەکەم) لاوک و حەیران.

(دووەم) بەیت.

(سێیەم) گۆرانی.

پاشتر دەبینین ئەو ڕیزکردنە، هێمایەکی چەندە گرنگی مێژوویی دەبەخشێت.

**پێ-٤ ئامانج و پلانی باسەکە:**

ئەوانەی باسکران، ئەو بابەتانەن، کە نامەکە پرسیارەکانی پێشوویان لە بارەوە دەرووژێنێت و لە قۆناغەکانیدا -بەگوێرەی ماوە و توانا- هەوڵی شیکردنەوە و هەڵسەنگاندن و پێشنیازی چارەسەرکردنیان دەدات، لە هەمان کاتیشدا ئامانجی باسەکە پێک دەهێنن.

بابەتەکانی نامەکە، ئەم پەیکەرەیان بۆ داڕێژراوە:

فەسڵی یەکەم بۆ جیاکردنەوەی ئاستە تیۆرییەکانی (کێش) و (ڕیتم) تەرخانکراوە. لەوێدا هەندێ لە پێناسە و تیۆرییەکانی ئەو دوو ڕەگەزەی شیعر هەڵسەنگێندراون و هەوڵدراوە ئەو ئاڵۆزییەی لە بەکارهێنانی ئەو دوو زاراوەیەدا دروست دەبێت، یەکلایی بکرێتەوە.

لە فەسڵی دووەمدا، کە هەوڵێکی پراکتیکییە بۆ پۆلینکردنەوەی کێشی خۆماڵی، کەموکوورییە بنەچەییەکانی بۆچوونە سەرەکییەکانی پێشوو خراونەتە ڕوو، لەو بوارەشدا بۆ هەر یەکێک لەو کێشانەی شیعری فۆلکلۆرییان لەگەڵدا بەراورد کراوە، نموونەیەکی تیۆری داڕێژراوە و ڕادەی لێکچوون و جیاوازییان لەگەڵ نموونە کوردییەکاندا دیاریکراوە.

لە فەسڵی سێیەمیشدا، هەندێ پێشنیاز بۆ دەستنیشانکردنی



سیستێمی ڕیتم لە جۆرەکانی شیعری فۆلکلۆریدا پێشکەش کراون، کە هەندێکیان بەهۆی تازەیی بابەتەکان لە ڕەخنەی کوردیدا، ناتوانرێت لە پێشنیاز دوورتر لێیان بڕوانرێت.

پێ-٤-١: پێش هەڵسووڕاندنی ڕاستەوخۆی بابەتەکان، پێویستە ئاماژە بۆ چەند سەرچاوەیەکی تایبەتی بکرێت کە بایەخێکی عەوازەیان بۆ مەبەستەکانی باسەکە هەبووە، لەم بوارەشدا دەبێ سەرەتا پەنجە بۆ دوو کتێبی بەنرخ ڕابکێشرێت، (د. خەزنەدار) فریای نامەکەی خستن:

یەکەمیان (کتاب العروض)ەکەی (مصطفى حركات)ە، کە ئاشنای تازەترین تیۆرییەکانی ڕیتمی کردین، هەرچەندە بۆچوونەکانی خۆی لە لێکدانەوەیەکی سەرپێیانەی تیۆرییەکان دوورتر نەڕۆیشتوون.

دووەمیان کتێبە دەگمەنەکەی (سۆن)ە: (Kurdish Grammar)، کە دەتوانین بەیەکەمین هەوڵی پراکتیکی بۆ پیشاندانی ڕۆڵی گرنگی سترێس لە شیعری فۆلکلۆری کوردیدا، بیژمێرین. بایەخی ئەو کتێبە لە باسەکانی فەسڵی سێیەمدا بەڕوونی ڕەنگی داوەتەوە.

هەر لە بواری ئەو فەسڵەدا، دەبێ ئاماژە بۆ کتێبە پڕ لە زانیارییەکەی (سەلاح ڕەئووف): (تیۆرەکانی مۆسیقا) بکەین، کە زۆربەی چەمک و زاراوە بەکاربراوەکانی شیکردنەوە مۆسیقاییەکان، لەبەر ڕووناکیی بابەتەکانی ئەو کتێبەدا ڕێگایان بەدی کردووە.

نابێ ئەوەش لە یاد بکرێت، لایەنێکی گرنگی سترێسبەندیی نموونە شیعرییەکانی کۆتایی فەسڵەکە، قەرزاری چوارچێوەی گشتیی دەستوورەکانی نامەی دوکتۆرییەکەی (د. عەبدولمەجید ڕەشید)ە: (The Phonemic system of Modern standard Kurdish)، هەرچەندە ئەو دەستوورانە تایبەت بەسترێسی وشەن: (فەرهەنگی)، کە هەندێ جار لە پرۆسێسی شیعردا جۆر و جێگای دەگۆڕێت.

لە دواییشدا، ئەو دەستنووسەی (د. عبدالمجيد حنون) لە (جەزایر)ەوە

بۆی ناردین و بریتییە لە وتارێکی نایابی (د. سید البحراوی) بەناونیشانی (نحو علم للعروض المقارن)، کە جگە لە بۆچوونەکانی خۆی یارمەتییان داین چاومان بەدابەشکردنەکەی (لۆتز) لە بواری سیستێمەکانی شیعری جیهانییەوە بکەوێت، ئەمەش ئاستێکی تیۆری ڕووناکی - هەرچەند جیاواز - بەنموونە و دابەشکردنەکانمان بەخشی.

گرنگیی ئەو وتارە لەوەدایە، لە بواری (زانستی بەراوردکاری کێشدا)، سێ لایەنی دۆخی فۆنیمیی دیاریکردووە: (چەندێتی، چۆنێتی، جۆر)، کە هەر زمانە و بەگوێرەی زاڵبوونی ئەدگارێکی، ڕێژەیەکی دیاریکراو بۆ پێکهێنانی سیستێمی ڕیتمەکەی: (بڕگە، سترێس، ئاوازە) ڕەچاو دەکات.

---

(١) کتێبخانەی ئەوقاف، سلێمانی، دەستنووسی ژمارە (٣٧٨٣).
(٢) اشارات أولية في الشعر التركي، ص٤٣.
(٣) دەستنیشانکردنی قۆناغەکانی گواستنەوەی شیعری کوردی، هەرچەند لەلایەن گەلێ نووسەرەوە بەشێوەی جیاواز ئاماژەی بۆ کراوە، بەڵام تا ئێستا بەوردی لە سنووری ڕێکی ساڵەکاندا دیاری نەکراون، هەرچۆنێک بێت، پۆلینکردنێکی دروست دەتوانێت -لە کۆمەڵی دەستکەوتەکانیدا - وەڵامێکی لەبار بۆ پرسیارە (بیزەنتی)یەکەی ڕەخنەی کوردی، کە گوایە (کێ؟!) ڕێبەری بزووتنەوەکەیە، گەڵاڵە بکات.
(٤) دیوانی گۆران، بەرگی یەکەم، ل٣.
(٥) اشارات أولية، ص٥٠.
(٦) قصائد مختارة من الشعر التركي، ص٢٥.
(٧) اشارات أولية، ص٥١.
(٨) نقد الشعر العربي الحديث في العراق، ص٢١٩.
(٩) أشارات أولية، ص٥٢.
(١٠) موحازەرەکانی کۆلیجی ئەدەبیات، بەغدا، ١٩٦١.
(١١) ژیان، ژمارە (٢٧)، ١٩٢٦.
(١٢) اشارات أولية، ص٤٠، بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٤).
(١٣) ژیان، (٢٨)، ١٩٢٦.



(١٤) هیوا، ژمارە (٣١)، ١٩٦١.
(١٥) ژین، ژمارە (٢١)، ١٩٧١.
(١٦) سەرچاوەی پێشوو، ژمارە (٢٣).
(١٧) موسيقى الشعر، ص ١٥٠.
(١٨) موحازەرەکان.
(١٩) سەرچاوەی پێشوو. لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ دیاردەیەکی سەرنج ڕاکێش بکرێت: لە هەر جێگایەکدا باسی (کێشی بڕگەیی) کرابێت، بەتایبەتی لەم بوارەدا، شیعری (فەرەنسی) لە پەنایەکدا خۆی حەشار داوە. پێشتر بینیمان (شێخ نووری) لە نموونە (تورکی)یەکان دەڕوانێت، لە کاتێکدا شیعری (تورکی)یش چاوی لە نموونەی شیعری (فەرەنسی) بڕیبوو کە لە سەدەکانی نێوەڕاستەوە بەشیعرێکی (بڕگەیی) پۆلینکرابوو، وەکو دووبارە دەبینین، (گۆران)یش لەنێو ئەو دوای سیستێمە شیعرییەکاندا، نموونە (فەرەنسی)یەکە، وەکو نزیکترین وێنەی کێشی خۆماڵی هەڵدەبژێرێت. تەنانەت لە ئاستە مێژووییەکەشدا، (بەنڤینیست) کە بەرگری لە بڕگەیی بوونی (گاتا)کان و (درەختی ئاسوریک) دەکات، ڕۆژهەڵاتناسێکی (فەرەنسی)یە.
(٢٠) سەرچاوەی پێشوو.
(٢١) کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، ل٢٧-٢٨.
(٢٢) نرخ شناسی، ل٢٧.
(٢٣) برایەتی، ژمارە (١٠)، ١٩٧١.
(٢٤) کاروان، ژمارە (٧٢)، ١٩٨٩.
(٢٥) ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٢)، ١٩٨٦.
(٢٦) گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، ژمارە (٢-١)، ١٩٨٦.
(٢٧) لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، ل٤٣-٨٧.
(٢٨) گۆرانی یا ترانەهای کوردی، ل١١-١٢.
(٢٩) شەفەق، ژمارە (٢)، ١٩٥٨.
(٣٠) کێش و قافیە، ل٣١-٣٨.
(٣١) کاروان، ژمارە (٧٦)، ١٩٨٩. لە ڕاستیدا (د. خەزنەدار) ئاماژەی بۆ هەندێ دیاردەی ئایینی و کۆمەڵایەتی، وەکو ڕەنگدانەوەی (ئایینی یەزیدی) لە فۆلکلۆری دیالێکتی کرمانجیی سەروو و (ئایینی یارسان) لە فۆلکلۆری دیالێکتی گۆران و دەروێشیزمی (قادری) و (نەقشبەندی) لەسەرجەمی ئەدەبەکەدا، کردووە، کە ڕەچاوکردنی وردیان بۆی هەیە ڕێکخستنێکی بنەڕەتی بەسەر هەندێ لە بۆچوونەکانی ئەمڕۆدا بهێنێت.

# فەسڵی یەکەم

## هەوڵێک بۆ ساغکردنەوەی هەندێ لایەنی تیۆری

* هەندێ سەرنجی گشتی لە بارەی کێش و ڕیتمەوە

١-١ سنوور و پێناسەکان

١-٢ وێنەیەکی جیاواز (پەخشانە شیعر)

١-٣ هەڵسەنگاندنی چەند تیۆرییەکی ڕیتم

١-٤ چنینی ئەنجامەکان

*** هەندێ سەرنجی گشتی لە بارەی کێش و ڕیتمەوە:**

کێش و ڕیتم دوو دیاردەی فرەپێوەندن، بەڵام ڕیتم بۆ خۆی ڕەگەزێکی بنچینەییە. لە هەموو وێنەکانی ژیاندا سیمایەکی ڕیتم دەبینرێت، تەنانەت لە شێوە بەرواڵەت نەجووڵاوەکانی ماددەشدا دەتوانین بەلای کەمەوە یەکێک لە سیماکانی تێبینی بکەین.

بەدەربڕینێکی هونەریانەتری وەکو ئەوەی (سینگوور)یش، کە بەلایەوە ڕیتم لە دەنگ و تەنانەت لە بێ دەنگیش دروست دەبێت: «ڕیتم بنیاتنەری بوونە، ئەو دینامیزمە ناوخۆییەیە کە ڕوخساری پێ دەبەخشێت (...) ڕیتم لە ڕێگای ماتریالترین و هەستیترین هۆکارەکانەوە... هێڵ، ڕووبەر، ڕەنگ، قەبارە، لە بیناسازی و پەیکەرتاشی و وێنەگرتندا، سترێس لە شیعر و مۆسیقادا، بزووتن لە سەمادا، خۆی دەنوێنێت»[١].

بەگوێرەی ئەو دەربڕینە، کە لە ڕاستیدا داڕشتنێکی هاوچەرخانەی بۆچوونێکی (ئەریستۆی)یە[٢]، ڕیتم لە هەموو هونەرەکاندا ڕەگەزی هاوبەشە.

لێکۆڵینەوەکانی (گۆندلاخ) لە بارەی گۆرانیی هیندییە سوورەکانی (ئەمەریکا) و تاقیکردنەوە پراکتیکییەکانی شێوەی دەربڕین لە شیعردا، کە (کیت هیڤنەر) ئەنجامەکانی تۆمار کردوون، سەلماندوویانە ڕیتم لە نواندنی باری دەروونیدا دیارترین ڕەگەزە[٣].

ڕیتم لە شیعر و گۆرانیدا، بەهۆی ئەو مێژووە دێرینەی پێکیانەوە دەبەستێت، لە بناغەیەکی هاوبەش پتر دادەمەزرێنێت. دەستنیشانکردنی سەرەتای پەیدابوونیان، لایەنێکی گرنگ لە سروشتی ڕیتم لە هەردووکیاندا پیشان دەدات؛ چونکە بەبۆچوونی زۆربەی لێکۆڵەران لەم بوارەدا، گۆرانی لە هەموو ئەدەبی جیهانیدا بناغەی شیعر بووە[٤].

بەگوێرەی (تیۆریی مۆسیقایی) لە پەیدابوونی زماندا، کە: «بۆ یەکەم



جار لەلایەن (یەسپرسن)ەوە خراوەتە ڕوو، زمان لە گۆرانییەوە داهاتووە، یان هەردووکیان لە یەک بنچینەوە دروست بوون (...) پێش ئەم قۆناغەش زمانی مرۆڤ بریتی بووە لە گۆرانییەکی بێ وشە (هەر ئاواز)»[٥].

ڕەنگە ئەمە بۆ مێژووی دەرکەوتنی ڕیتم سەرەتایەکی لەبار بێت، بەتایبەتی ئەگەر لەگەڵ بۆچوونەکەی (ڕۆسۆ)دا ئاوێتە بکرێت کە بەلایەوە دووبارەکردنەوە کێشراوەکانی ڕیتم و گۆڕینی پلە ئاوازەییەکانی سترێس، شیعر و مۆسیقایان لەگەڵ زماندا هێنایە کایەوە[٦].

بەو شێوەیە، کێش و ڕیتم کە سترێس دەبێت بەهەوێنیان، هاوکات لەگەڵ شیعر و مۆسیقادا وەکو دوو ئەدگاری سەرەتایی ڕێکخستن چرۆ دەکەن. هەر لەوەدەمەشەوە بەراوردکردنی هەردوو هونەری شیعر و مۆسیقا، ڕەوابوونی خۆی سەلماندووە.

١-١ سنوور و پێناسەکان:

ڕیتم بەهۆی دەستکەوتە گرنگەکانی فەلسەفەی (فیتاگۆرس) و قوتابییەکانیەوە، بەتایبەتی لە بواری هارمۆنیکی ژمارەکان و دەستنیشانکردنی مییانە دەنگییەکانی مۆسیقادا، زووتر تیۆریزە کرا[٧]. ئەو هەنگاوە کاریگەرە، کە ڕیتمی وەکو هاوواتایەکی «خوڕی و داڕژان» لە چەمکە فەرهەنگییەکەی دابڕی، ڕێگای خۆشکرد لە بواری شیعریشدا دەستە بەشەکانی کێش لە نزیکەوە بناسرێن.

لێرەدا، وەکو (ڕینێ ویلیک) لە جێگایەکی هاودۆخدا ڕوونی کردۆتەوە، پێویستیمان بەلێکدانەوەی سەد و یەک بۆچوون لە بارەی سروشتی ڕیتمەوە نییە، ئەوەندەمان بەسە دوو دەستە بۆچوون لە یەکتر جیاکەینەوە: ئەو بۆچوونانەی گێڕانەوە بەمەرجی ڕیتم دادەنێن، ئەوانەی فراوانتر لە ڕیتم دەڕوانن و شێوە دووبارە نەکراوەکانیش لەو خانەیەدا پۆلین دەکەن[٨]. لەو ڕوانگەیەوە، بۆچوونەکان بەسەر ئەم دوو دەستەیەی خوارەوەدا دابەش دەکەین:

(ئەلف): ئەو بۆچوونانەی (کێش) بەمەرجی شیعر دادەنێن.

(بێ): ئەو بۆچوونانەی (شیعر) لە شێوە بێ کێشەکانیشدا دەبینن.

١-١-١: وەکو لە زۆربەی بوارە تیۆرییەکانی زانست و زانیاریدا باوە، کۆنترین نموونەی بۆچوونەکانی دەستەی (ئەلف)، لە سەرچاوەکانی فەلسەفەی گریکیدا دەست دەکەون.

(ئیفلاتون) لە زۆربەی بەرهەمەکانیدا ئاماژەی بۆ ڕیتم کردووە. لە (یاسا)کەیدا، وێنەیەکی زۆر گشتی پێشکەش دەکات کە پتر چەمکە فەرهەنگییەکەی (خوڕی و داڕژان) دووپات دەکاتەوە، بەڵام لە گفتوگۆ (سوکرات)ێکانیدا، شیکردنەوەیەکی بابەتیانەتر دەخاتە ڕوو. لەوێدا پاش ئەوەی ڕیتم بەیەکێک لە بنچینەکانی سروود دیاری دەکات، باسی سێ جۆر لە ڕیتم دەکات: ڕیتمی لێکدراوی جەنگی، ڕیتمی شیعر و ڕیتمی قارەمانێتی. لە بواری ڕیتمی شیعردا بەزمانی (سوکرات)ەوە، بەڕوونی ئاماژە بۆ ئەدگارە بنچینەییەکی کێشی گریکی: (برگە کورت و درێژەکان) و نیشانەکانیان دەکات[٩].

(ئەریستۆ) لە بۆچوونێکی وردتردا، کە مرۆڤ بەزەحمەت دەتوانێت تەنیا وەکو پێناسەیەک تەماشای بکات، کێش بەجۆرێک لە جۆرەکانی ڕیتم دادەنێت. لەو دەقەی بۆچوونەکەی لێ وەرگیراوە، لە دوو ئاستەوە لە ڕیتم دەڕوانێت: ئاستی شیعر و ئاستی پەخشان.

شیعر و پەخشان بەلای (ئەریستۆ)وە، هەردووکیان لە وتەی ڕیتمی (ژمارەدار) پێکهاتوون، بەڵام جیاوازییان لەوە دایە لە شیعردا (کات) سنوور بۆ ژمارەکان دەستنیشان دەکات، ئەمەش چەمکە (ئەرستۆ)ییەکەی پێناسەکردنی (کێش)ە. هەرچی پەخشانیشە، بەڕای ئەو نابێت ئەو ئەدگارەی ڕیتمی شیعر بەکاربێنێت؛ چونکە هەوڵێکی وا پەخشانەکە لە دەستکردی نزیک دەکاتەوە و وا دەکات گوێگر چاوەڕێی شێوەیەکی دیاریکراوی دووبارەکردنەوە بکات[١٠]. بەو شێوەیە، شیعر و



پەخشان لەسەر هەمان بناغەی ڕیتمی دادەمەزرێن، بەڵام ئەو مەرجەی ڕەگەزی (کات) بەسەر ڕیتمەکەیدا دەسەپێنێت، جیاوازییەکی وا لە نێوانیاندا دروست دەکات، هیچ هەڵێک بۆ ڕەچاوکردنی ڕۆڵی ڕیتم لە پەخشاندا لە توانادا نەبێت. لێرەش بەدوا، هەموو بۆچوونەکانی سەر بەم دەستەیە، خۆیان لە دوو کۆتی ئەو بۆچوونە بۆ ڕزگار ناکرێت:

(یەک): دانانی کێش بەسەرەکیترین پێوەری جیاکردنەوەی شیعر و پەخشان.

(دوو) وەکو ئەنجامێکی خاڵی پێشوو، لێرەوە (ڕیتم) لە شیعردا هیچ کەسایەتییەکی سەربەخۆی نامێنێت و تەنیا لە (کێش)دا بەرجەستە دەکرێت.

١-١-٢: ئاوڕدانەوەی زانا موسڵمانەکان لە بابەتەکانی کێش و ڕیتم لە شیعر و مۆسیقادا، ڕۆڵێکی سەرەکیی لە چەسپاندنی بۆچوونەکانی (ئەریستۆ) لە شیعری ڕۆژهەڵاتیدا گێڕا. پێشکەوتنی زانیارییە مۆسیقاییەکان و دۆزینەوەی کێشە عەرووزییەکان لەلایەن (خەلیلی فەراهیدی)یەوە، زەمینەیەکی لەباریان بۆ بەستنەوەی بەهێزی کێشی شیعر بەئەدگارە ڕووتەکانی ڕیتم لە مۆسیقادا خۆشکرد، ئەو بەستنەوەیە بەئەندازەیەک پتەو بوو، ئیدی (کێش) وەکو زاراوەیەک تەنیا بۆ شیعر و (ڕیتم)یش تەنیا لە بواری مۆسیقادا پۆلێن کران.

(کندی) لە بۆچوونێکدا، پاش ئەوەی شیعر بە: «وتە ژمارەییەکان» و ڕیتم بە: «ڕێژە کاتییەکان» پێناسە دەکات، (تەفعیلە عەرووزییەکان) لەگەڵ ڕیتمی مۆسیقادا بەراورد دەکات و دەگاتە ئەو ئەنجامەی ئاهەنگ لە مۆسیقادا، بەرامبەر بەتیپ لە شیعردا دەوەستێت[١١].

ئەو وێنەیە لای (فارابی) ڕوونتر دەردەکەوێت، بەلای ئەوەوە: «کێش بۆ تیپەکان وەکو ڕیتم بۆ ئاهەنگەکان وایە»[١٢].

هەرچەند «ئیبن سینا»ش لە چوارچێوەی بۆچوونەکانی پێشوو

دەرناچێت، بەڵام ڕەفتارێکی هونەریانەتریان لەگەڵدا دەکات: «شیعر وتەیەکی ئەندێشەسازە، لە ئاخاوتنی هاوسەنگ و چوونیەک دروست دەبێت، لەلای عەرەبیش قافیەدارە. هاوسەنگی بەو واتایە ژمارەیەکی ڕیتمیی هەبێت، چوونیەکیش بەو واتایەی ماوەی کاتەکانی هەر بەشێکی ئەوەندەی ماوەی بەشەکانی دیکە بێت»(١٣).

وەکو دەبینین تەنانەت کە باسی ڕیتمیش دەکرێت، هەر لەبەر سێبەری (کێش)دا لێی دەڕوانرێت، وەکو لە بۆچوونەکەی (ئیبن سینا)دا دەردەکەوێت. کەواتە لێرەشدا، وەکو لە بۆچوونە (ئەریستۆ)ییەکەدا بینیمان، هاوکاتیی دەستە بەشەکانی ئاخاوتن. تەنیا پێوەرێکە وتە ڕیتمییەکان لە یەکتر جیا دەکاتەوە(١٤).

١-١-٣: ئەگەر بێتو (ئای. ئەی. ڕیچاردز) بەیەکێک لە لووتکەکانی ڕەخنەی ئینگلیزی بژمێررێت، تەنانەت وەکو (هایمان)یش بڕیار دەدات «خوڵقێنەری» ڕەخنەی هاوچەرخی جیهانی بێت(١٥)، ئەوا دەتوانین بەدڵنیاییەوە بۆچوونەکانی لە بارەی کێش و ڕیتمی شیعرەوە، بەبەرجەستەکاری هێزی داڕشتنەکانی (ئەریستۆ) لە سەردەمی نوێدا دابنێین. لەم دەقەی خوارەوەدا، هەردوو بۆچوونە گرنگەکەی (ئەریستۆ): (کێش وێنەیەکی ڕیتم و گوێگر بۆ شێوەیەکی دیاریکراوی چاوەڕێ کردن ئامادە دەکات)، بەئاشکرا دیارن: «ڕیتم، وەکو کێش کە وێنەی تایبەتییەتی، پشت بەدووبارەکردنەوە و چاوەڕوانی دەبەستێت. شوێنەوارەکانی کێش و ڕیتم لە چاوەڕێکردنی ئێمەوە هەڵدەقووڵێن، جا ئەوەی چاوەڕێی دەکەین ڕوودات یان نا»(١٦). کەواتە گرنگیی بۆچوونەکانی (ڕیچاردز) لە نوێخوازییاندا نییە، بەڵکو لەو ئەنجامانەدایە دەیانبەخشن.

یەکێک لەو ئەنجامە گرنگانە، پێناسەکردنێکی ڕیتمە، کە لە بۆچوونەکانی پاشتردا گەلێ لقی بەرداری لێ دەبێتەوە. (ڕیچاردز) لەو پێناسەیەدا، ڕیتم بەو ئەتەمە (النسیج) دادەنێت کە چاوەڕوانی و



ڕوودان و ڕوونەدان و سەرسوڕمان لە چوارچێوەی ڕێڕەوی بڕگەکاندا دروستی دەکەن، کارکردنی دەنگی وشەکانیش، تەنیا لە ڕێگای ڕیتمەوە بەدواپلەی هێزی خۆی دەگات(١٧).

گرنگیی ئەو لێکدانەوەیە لەوەدایە کاتێ لە ڕوانگەی وێنە تایبەتییەکەی ڕیتمەوە سەرنجی دەدرێتێ، لەو دۆخەدا دژایەتییەکی سەیر ڕوو دەدات: لە کاتێکدا شێوەی دووبارەکردنەوە لە وتەی کێشراودا: (شیعر)، بەوردی چاوەڕوان دەکرێت، لە وتەی بێ کێشدا: (پەخشان)، چاوەڕێکردنەکە بەو وردییە ڕوونادات. تا ئێرە هیچ ڕایەکی لەوەی (ئەریستۆ) تازەتر بەرچاو ناکەوێت، بەڵام لەو هاوکێشە ئاساییەوە، (ڕیچاردز) خاڵێکی یەکجار بایەخدار دەردەکێشێت: سنووری نێوان شیعری کاریگەر و شیعری بێزارکار، لە جۆری ئەو وەڵامەدایە شیعرەکە بەخوێنەر، یان گوێگری دەداتەوە، تا ڕوودانی گێڕانەوەکان لەگەڵ چاوەڕێ کردندا جووت بێت، شیعرەکە پاش یەک دوو دێڕ هێزی ستاتیکیی خۆی لە دەست دەدات. بەپێچەوانەشەوە، تا زنجیرەی چاوەڕێکردنەکە تێکدات - پێویستە لە یاد نەچێت هەر لە سنووری کێشداین - شیعرەکە کاریگەرتر دەبێت.

لەو خاڵەی پێشووەوە، (ڕیچاردز) بەئەنجامێکی گرنگتر دەگات: دابەشکردنی شیعر بەسەر ژمارەیەک بڕگەدا و بڕگەکان بەسەر ژمارەیەک (هەنگاو)دا، بەلای ئەوەوە بنچینەیەکی دروستی نییە؛ چونکە لە تاقیکردنەوەی شیعردا، (بیر) سەرگەرمی بابەت و جیاوازیی لەوان وردترە، بەتەواوی وەکو ئاوازێکی مۆسیقایی، جارێک مۆسیقازانێک بیژەنێت و جارێکیش بە(نۆتە) تۆمار بکرێت(١٨).

لەو بۆچوونانەوە، دەتوانین سیمای سنوورێکی جیاکەرەوە لەنێوان کێش و ڕیتمدا تێبینی بکەین، کە ئێستا یەکسەر لەم دەقەی خوارەوەی (ئارۆن کۆپلاند)دا دەیبینین.

(کۆپلاند) لای وایە ئێمە کاتێک دێڕە شیعرێک دەخوێنینەوە: «لەو

خوێندنەوەیەدا پێڕەوی لە سیستێمی ژمارەی بڕگەی وشەکانی دێڕە شیعرەکە دەکەین نەک ڕیتمەکەی؛ چونکە ئەمیان تەنیا لە ڕێگای خوێندنەوەی دێڕەکە بەگوێرەی واتاکەی بەدەست دەهێنرێت»[19].

لەو دەقەی پێشوودا، کە مۆسیقای تیۆری پێشکەش بەشیعری کردووە، (واتا) وەکو هاوتایەکی ڕیتم پیشان دراوە. ئەم بۆچوونە، ئەنجامی گرنگتر بەدەستەوە دەدات.

١-١-٤: ئەگەر چەند بۆچوونێکی ناتەواوی وەکو «سەربەخۆیی دەقی شیعر لە خودی مەبەستەکەیدا» و «زمانی ئەودیوی هۆش... هتد» پشتگوێ بخەین کە (فۆرمالیستە ڕووسەکان) بەگەرمییەکی سەیرەوە بەرگرییان لێ دەکردن، ڕەنگە بتوانین سوودێکی پتر لە بۆچوونەکانیان - بەتایبەتی لە بواری پراکتیکی و شیکردنەوەی شیعردا- وەرگرین.

با لە سەرەتادا، لە دەروازەی ئەم دەقەی خوارەوەی (ڕینێ ویلیک)ەوە، ئاشنای هەندێ لە بۆچوونە گشتییەکانیان بین:

«فۆرمالیستە ڕووسەکان هەوڵیاندا، کێش لەسەر بنچینەیەکی تەواو تازە دابنێن. (هەنگاو - تەفعیلە) بەلای ئەوانەوە زاراوەیەکی لەبار نییە؛ چونکە گەلێ جۆری شیعر هەیە هەنگاویان تێدا نییە. (هاوکاتی)ش هەرچەند بەسەر گەلێ جۆری شیعردا دەچەسپێت، ئەوا هەر ئەو نموونانە دەگرێتەوە (...) ئەوان بەربەرەکانێی تیۆرییەکانی دیکە دەکەن کە هەموویان لە پێناسەکردنی یەکەی بنچینەیی ڕیتمی شیعردا بەهەڵەدا دەچن. ئەگەر تەماشای شیعر بکەین وەکو چەند بەشێک لە دەوری بڕگەیەکی بەهێزدا کۆدەبنەوە (یان بڕگەیەکی درێژ لە ڕێبازە چەندییەکاندا) ناتوانین نکوڵی بکەین ئەو کۆبوونەوانە، تەنانەت سیستێمی کۆبوونەوەکانیش، لە چەند وتەیەکی زمانیدا هەن ناتوانین ناوی شیعریان لێ بنێین. کەواتە، یەکەی بنچینەیی لە ڕیتمدا هەنگاو نییە، بەڵکو هەموو دێڕە شیعرەکەیە»[20].

فۆرمالیستەکان هەر لە سەرەتاوە (زمانی سادە) و (زمانی شیعر)یان



لە یەکتر جیاکردەوە. لەو دوو جۆرەی زماندا، دەتوانین دوو شێوەی پێکهاتنی سیماکان -یان ڕیتم بۆ مەبەستی باسەکەمان- دەستنیشان بکەین: شێوەیەکیان کار ناکات، لەبەرئەوە بایەخێکی سەربەخۆی نییە: (ڕیتمی زمانی ڕۆژانە). بەڵام شێوەکەی دیکە کار دەکات و بایەخێکی سەربەخۆشی هەیە: (ڕیتمی شیعر). ئەمە ئەو دابەشکردنەیە کە (یاکۆبنسکی) لە یەکەم بڵاوکراوەی بەکۆمەڵی فۆرمالیستەکاندا ڕایگەیاند بوو[21].

ئەو پۆلینکردنە لای (یاکۆبسن) تووشی ڕێکخستنێکی بنچینەیی دەبێت (میکانیزمی کارکردنەکە، نەک سیستێمەکەی)، بەجۆرێک جیاوازیی هەردوو شێوە ڕیتمەکە، لە ڕادەی ئەو ئەرکەدا دەردەکەوێت هەریەکەیان لە زمانی بەرهەمهێنراودا جێبەجێی دەکەن: ڕادەی زاڵی و سەرەکی بوونیان: «شیعر ڕێکخستنێک بەسەر ڕیتمی زمانی ڕۆژانەدا دەسەپێنێت لە هاوکاتیی تەواو نزیکی دەخاتەوە»[22].

لێرەدا، ڕیتمی زمانی ڕۆژانە هەرچەندە زاڵ نییە، ئاراستەکار نییە، لەگەڵ ئەوەشدا بوونی هەیە و کار دەکات. ئێستا دەستبەجێ دەبینین، لەو شیکردنەوەیەدا کە (مۆکارۆڤسکی) لەبەر کارتێکردنی ئەو لێکدانەوەیەی (یاکۆبسن)دا دەینووسێت، ئەو دوو شێوە ڕیتمییە چۆن کار لە یەکتر دەکەن.

(مۆکارۆڤسکی) لە شیکردنەوەی شیعری (چیکی)دا، ڕێگایەکی سادە و لە هەمان کاتیشدا گرنگ بەکار دەهێنێت، ئەو ڕێگایە بریتییە لە بەکارهێنانی سروشتی سترێسی زمان بۆ دەستنیشانکردنی مۆسیقای شیعرەکان، لەو ڕێگایەشەوە دوو ئاستی مۆسیقایی لە شیعرەکاندا دیاری دەکات:

ئاستی ڕستە و ئاستی دێڕە شیعر. مۆسیقای ڕستە لە ڕێگای سترێسی وشەوە دەستنیشان دەکات کە لە زمانی (چیکی)دا هەمیشە لەسەر بڕگەی یەکەمدایە. مۆسیقای شیعریش، کێشی شیعرەکە پیشانی

دەدات. ئەنجامی ئەم پرۆسێسە دووپاتی دەکاتەوە: «بڕگەی یەکەم لە هەر دێڕێکی هۆنراوەکەدا (لێرەدا تاقیکردنەوەکە بۆ شیعرێکی پێنج هەنگاویی ئەیامبی کراوە - م.ب)،(٢٦) بار لە هەر (١٠٠) باردا سترێسدارە، لەکاتێکدا بڕگەی یەکەم لەو کێشەیەدا، دەبێ هەمیشە بێ سترێس بێت»[٢٣].

بەو شێوەیە، دەگەینە پلەیەک لە تێگەیشتنی پێوەندیی نێوان کێش و ڕیتم، کە پێوەندییەکانی زمانی ڕۆژانە و زمانی شیعر دەستنیشانی دەکەن. بەگوێرەی ئەو بۆچوونانەش «کێش لە بزووتنی کاتەکاندا کۆمەڵە پێوەندییەکی نەگۆڕە، کە نابێت لەگەڵ چەمکی فراوانی ڕیتمدا تێکەڵ بکرێت»[٢٤].

بۆ ئەوەی بەدوا پلەی ئەنجامەکانی ئەو بۆچوونانە بگەین، پێویستە ڕوو لە جۆرێکی دیکە لە شیکردنەوەی شیعری بکەین کە لە دەرەوەی چوارچێوەی کێشەوە لە ڕیتم دەڕوانێت.

١-٢ وێنەیەکی جیاواز (پەخشانە شیعر):

سەدەی نۆزدەیەم، لە ڕێگای تاقیکردنەوە شیعرییەکانی شاعیرانی وەکو (والت وایتمان)، کە لە جیهانی ئەنگلۆسەکسۆنیدا بە(شیعری سەربەست) ناسرابوون، هەروەها بەرهەمە شیعرییەکانی (شارل بۆدلێر)، کە لە جیهانی لاتینیدا بە(پەخشانە شیعر) ناویان دەرکردبوو، ڕەخنەی هاوچەرخی ئاشنای سنوورێکی ڕوونتری نێوان کێش و ڕیتم کرد. لێرەوە پێویستە ئاوڕ لە دەستەی دووەمی ئەو بۆچوونانە بدەینەوە کە (کێش) بەمەرجی شیعر دانانێن، واتە بۆچوونەکانی دەستەی (بێ)، (١-١).

١-٢-١: کە باسی شیعری بێ کێش دەکرێت، (پەخشانە شیعر) یەکسەر وەکو نموونەیەکی دیار، خۆی پێشکەش دەکات[٢٥]. لە ڕاستیشدا ئەم شیعرە مێژوویەکی لەوە دێرینتری هەیە: (نێوان سەدەی هەژدەیەم و سەدەی نۆزدەیەم)، کە ئێمە لەم قۆناغەی بابەتەکەدا باسی دەکەین.



ئەم شیعرە، هەر لە سەرەتای ئەو هەوڵانەی (ڕاسین) و (مۆلییێر) بۆ گۆڕینی شیعری (فەرەنسی) دەیاندا، لەگەڵ بزووتنەوەی وەرگێڕانی کۆمەڵێکی زۆر لە شیعرە لیریکەکانی (هۆراس) و (میلتۆن) لەلایەن نووسەرانی وەکو (ساندۆن) و (دۆسان)ەوە، هەروەها ئەو لێکۆڵینەوەیەی (تیرگۆ) لە بارەی (پەخشانی کێشدار)ەوە نووسیی، تا دەگاتە شیعرەکانی (شاتۆبریان) و لە دواییشدا (بۆدلێر) و (ڕامبۆ) و (مالارمێ) و کۆمەڵێکی دیکە، هەموو ئەو هەوراز لێژیانە ویستیان ئەوە بسەلمێنن کێش و قافیە لە شیعردا هەموو شتێک نین[٢٦].

سەرچاوەی زۆربەی پێناسە و بۆچوونەکان لە بارەی (پەخشانە شیعر)ەوە، کتێبە ناسراوەکەی (سۆزان بەرنار)ە[٢٧]، کە ئەم دەقەی خوارەوەی لێ وەرگیراوە: «گومانی تێدا نییە لە پەخشانە شیعردا (لە هەمان کاتدا) هێزێکی نارێکی رووخێنەر، کە ڕوخسارە باوەکان وەلا دەنێت و هێزێکی ڕێکخەر، کە هەوڵی بنیاتنانی (یەکێتی)یەکی شاعیری دەدات، شان بەشانی یەکتر کاردەکەن. خودی زاراوەی (پەخشانە شیعر) ئاماژە بۆ ئەو دوولایەنیە دەکات»[٢٨].

ئەو دژایەتییە چی دەگەیەنێت؟ یان، ئەگەر پرسیارەکە بەشێوەیەکی وردتر ئاراستە بکەین: ئەو بۆچوونەی (بەرنار) هەتا چ ڕادەیەک لەگەڵ، یان دژ بەبۆچوونەکەی (ریچاردز)ە؟ هەر وەڵامدانەوەیەکی ئەو پرسیارە، دەبێ تێبینی ئەوە بکات ڕیتم لە بۆچوونەکەی (ریچاردز)دا لە چوارچێوەی کێشدا کار دەکات، بەڵام لە (پەخشانە شیعر)دا، پێویستی ئەو ڕەگەزە نییە. ڕەنگە زاراوەی (ڕیتمی ناوەوە) بتوانێت چاکترین یارمەتی پێشکەش بکات.

١-٢-٢: لە (پەخشانە شیعر)دا ڕیتمی دەرەوە، واتە کێش، سنوور بۆ بەشەکانی دەقەکە دیاری ناکات، ڕیتمی ناوەوە ئەرکی سەرەکی دەگێڕێت؛ چونکە شیعر لێرەدا هاووتای کێش نییە، لێرەدا هێزی گەیەنەری وێنە شیعرییەکان و ڕێکخستنی بزووتنەکانیەتی. ئەم

ئەنجامەش بەزەحمەت لە دۆخی زاڵبوونی ڕیتمی دەرەوەدا بەسەربەستی ئەنجام دەدرێت[٢٩].

لە ڕاستیدا زاراوەی (ڕیتمی ناوەوە)، لەگەڵ ئەوەی زۆر لە بارەیەوە نووسراوە، تا ئێستا نەتوانراوە وەکو چەمکێکی دیاریکراو دەستنیشان بکرێت. گومانی تێدا نییە چەند دەربڕینێکی وەکو «یاخیبوون لە زمانی ڕۆژانە» و «شیعری چڕوپڕ» و «پێوەندییە ستوونی و ئاسۆییەکانی دەنگەکان، لە زەنگ و واتا و هێما» و ژمارەیەکی دیکە لەم بابەتانە، تەنیا دەتوانین لە مەسەلەکە نزیکمان خەنەوە.

لەم دەقەی خوارەوەدا، (ئەدۆنیس) هەوڵ دەدات پێناسەیەکی بابەتیانەتر بخاتە ڕوو: «پەخشانە شیعر ڕیتمێکی نوێ دروست دەکات پشت بەڕیتمی هۆنراوەی کێشراو نابەستێت، ڕیتمێکی هەمەڕەنگە لە هاوتەریبی و دووبارەکردنەوە و ستریس و دەنگ و ڤاوڵی درێژ و ئاوێتەبوونی تیپەکاندا خۆی دەنوێنێت»[٣٠]. لێرەشدا تووشی ژمارەیەکی دی لە زاراوە و دەربڕینی جۆراوجۆر دەبین، کە لە ئاستی پراکتیکدا بەزەحمەت جێبەجێ دەکرێن.

لە ئەدەبی ئەنگلۆ سەکسۆنیدا، بەتایبەتی لە تاقیکردنەوەکانی (وایتمان)دا، دەتوانین ئەم شێوە ڕیتمییانەی خوارەوە دەستنیشان بکەین:

١- هاوتەریبی هاوتایی.
٢- هاوتەریبی دژایەتی.
٣- هاوتەریبی لێکدراو.
٤- هاوتەریبی باڵا، یان ڕیتمی بەرزڕۆ.

«ئەمانە، ئەو هۆکارە ستاتیکی و بنیاتیانەن کە توانای دروستکردنی بنیاتێکی ڕیتمی جیا لە سیستێمی ئاسایی کێشیان هەیە. سەرەڕای ئەمەش پەخشانە شیعری ئەوروپایی بایەخی بەپێکهێنانی مۆسیقایەکی



ناوخۆیی داوە، کە لە ڕێگای چەند دیاردەیەکی وەکو (جیناس)ی سەرەتایی و دووبارەکردنەوە و دابڕینی ڕیتمی و هاوشێوەیی و ڕیتمی بیرۆکە و... هتد دەستەبەر دەبن»[٣١].

لەگەڵ هەموو ئەو پێناسەکردن و ڕوونکردنەوانەشدا، زاراوەی (ڕیتمی ناوەوە)، هێشتا پێویستی بەچوارچێوەیەکی تیۆریی وردتر هەیە.

### ١-٣ هەڵسەنگاندنی چەند تیۆرییەکی ڕیتم...:

وەکو لە کەرتی یەکەمدا بینیمان، ڕیتم چەمکێکی گەلێ فراوانی هەیە، ئەو چەمکە لە چوارچێوەی کێشیشدا تەنگ نابێتەوە. بۆیە کە باسی کێش دەکرێت، زۆرجار لەگەڵ ڕیتمدا ڕەنگیان تێکەڵ دەبێت. ئەو تیۆرییانەی لەم کەرتەدا باسیان دەکەین، بەشێکی یەکجار کەمن لەو کۆمەڵە تیۆرییانەی ناونیشانی کەرتەکە دەیانگرێتەوە، ئەمە جگە لەوەی بەگشتی سەر بەدەستەی یەکەمی بۆچوونەکانن کە لە کەرتی پێشوودا باسکران. ئەمەش شتێکی سەیر نییە؛ چونکە بەزۆری ئەو دەستەیە لە سروشتدایە خۆی بەپێویستییەکانی تیۆری بسپێرێت.

ڕەنگە ئەگەر ژمارەیەکی پتر سەرچاوەی تیۆریمان لەبەردەستدا بوایە – کە نەک هەر لە زمانی کوردیدا، بەڵکو بەگشتی کەمن – وەکو باسێکی ئەکادیمی پێویست دەکات، بمانتوانیایە بەگوێرەی بۆچوونی چەند قوتابخانەیەکی جیاواز، لایەنەکانی بابەتەکە داڕێژین، بەڵام شتێکی وا لەم هەلەدا لە توانادا نییە.

سەرەڕای ئەوەش، ئەو زانیارییانەی ئێستا لەبەردەستدان، هانی هەوڵێکی وا نادەن. بەنموونە، هەرچەند دەتوانرێت لە دەروازەی زانستی دەروونەوە لە بۆچوونەکانی (ڕیچاردز) و (فۆرمالیستەکان) بڕوانرێت، بەڵام لە دواییدا هەر دەبێ ئەو ئامرازانە بۆ شیکردنەوەکانمان بەکاربێنین کە بۆ ئەو دوای بۆچوونەکان بەکاردێن. ئەمەش بابەتەکە دەباتە نێو سنووری ڕێبازەکانی شیکردنەوەوە.

١-٣-١ تیۆریەکەی (ڤایل):

«لە هەموو زمانێکدا... ڕیتمی شیعر (پێکهاتنی شیعر - ڕێکخستن لە شیعردا، بەگشتی (Verse) یان دێڕ بەنموونە) و کێش (Meter) کە دەربڕینی دەرەوەی ڕیتمە، لەم دوو هۆکارەی خوارەوە هەڵدەقوڵێت:

١- ڕەچاوکردنی سیستێمێکی دیاریکراو بۆ دووبارەکردنەوەی بڕگەکان لە دێڕە شیعردا.

٢- ڕوودانێکی ڕێکی هێز (Accent) یان بەهۆی ستریسەوە (Stress)، یان لە ڕێگایەکی دیکەوە.

«پێوەندیی ڕیتمی دێڕە شیعرێک بەئەدگارە دەنگییەکانی ئەو زمانیەی پێی نووسراوە (Phonetic)، بەئەندازەی پێوەندیی بڕگەکانی وشە لە پەخشانی ئەو زمانەدا (بەو ئەدگارانەوە) بنەڕەتییە. مەسەلەش لە پێش هەموو شتێکدا مەسەلەی خایاندنی کات (Duration)ی بڕگەکان و جۆری ئەو هێزەیە کە پێی گۆ دەکرێت»[٣٢].

ئەگەر لە دەروازەی سەرنجەکانی (کەمال ئەبوو دیب)ەوە، کە دەقی تیۆریەکەی (ڤایل)ی وەرگرتووە، تێبینی بابەتەکە بکەین، پێویستە ئەم سێ تێبینییە تۆمار بکەین:

١- بەڕای (ئەبوو دیب)، خاڵی یەکەمی تیۆریەکە هەموو شیعرێک ناگرێتەوە (شیعری فەرەنسی و ژاپۆنی - بەنموونە) کە بەبۆچوونی ئەو، ئەو دوو جۆرە شیعرە سیستێمێکی دیاریکراوی ڕێکخستنی بڕگەییان نییە.

٢- تێبینی دووەم ئاراستەی ڕۆڵی ستریس دەکات، کە هەموو شیعرێک ئەو ئەدگارە بەکار ناهێنێت.

٣- لە بارەی پێوەندیی نێوان ئەدگارەکانی زمان و جۆری ئەو شیعرەی نەتەوەیەک دای دەهێنێت، بەڕای (ئەبوو دیب) بۆچوونێکی ورد نییە. پێش ئەوەی ڕای خۆمان لە بارەی تیۆریەکەی (ڤایل)ەوە بخەینە ڕوو،



بەپێویستی دەزانین سەرنجێکی سەرپێیی ئاراستەی ئەو سادەگەرییەی تێبینییەکانی (ئەبوو دیب) بکەین، کە بەڕای ئێمە لەگەڵ پلەی ئەودا ناگونجێت.

سەبارەت بەشیعری (فەرەنسی) و (ژاپۆنی) کە بەڕای (ئەبوو دیب) دەبێ ڕیتمیان نەبێت، لە فەسڵی داهاتوودا هەندێ بەدرێژی ئاوڕ لەو لایەنانە دەدەینەوە، بەڵام وەکو ڕاستییەکی لۆجیکی، هیچ (شیعرێک) بێ ڕیتم نابێت، کەواتە تەنیا کێش دەمێنێتەوە، ئەمەش (ئەبوو دیب) و غەیری ئەویش دەیسەلمێنن. تێبینییەکەی دووەمیشی بەئاسانی ڕەت دەکرێتەوە، (ڤایل) تەنیا ستریسی وەکو مەرجێکی ڕیتم دەستنیشان نەکردووە، ئەو دەڵێت یان ستریس «یان لە ڕێگایەکی دیکەوە دەقەکە».

لە بارەی پێوەندیی ڕیتمی شیعر بەئەدگارە دەنگییەکانی زمانێکی دیاریکراوەوە، دەتوانین لەگەڵ (ئەدوارد ساپیر)دا بەربەرەکانێی (ئەبوو دیب) بکەین و لە بۆچوونەکەی (ڤایل)یش دوورتر بڕۆین: «لە سیستێمی دەنگیی زمانێک بکۆڵەوە، بەتایبەتی لە سیما کاریگەرەکانی، دەزانیت پەرەی بەچ جۆرە شیعرێک داوە (...) لە داهاتووشدا پەرە بەچ شیعرێک دەدات»[٣٣]. تیۆریەکەی (ڤایل)، هەر لە یەکەم هەنگاوەوە لایەنگیریی خۆی لە بۆچوونە بنەڕەتیەکەی (ئەریستۆ) دەردەخات: (کێش وێنەی تایبەتی ڕیتمە).

ئەو لایەنگیرییە، پێکهاتنە دوو خاڵییەکەی تیۆریەکە هەڵدەوەشێنێتەوە و هەر خاڵێکیان دەکات بەهاوجێی ئەویدی. ئەگەر بڕگەکانی دێڕە شیعرێک بەگوێرەی (سیستێمێکی دیاریکراو) دووبارە بنەوە، ئەوا هەر ئەو سیستێمە، ستریس یان هەر ئەدگارێکی سەرەکیی زمان لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت. ئەگەر لە خاڵی دووەمیشەوە دەست پێ بکەین، بەهەمان ئەنجام دەگەین: (ڕوودانی ڕێکی ستریس) ئەوە دەگەیەنێت بەشەکانی ئاخاوتنی شیعری (بڕگەکان لە دەقەکەدا)، بەگوێرەی (سیستێمێکی دیاریکراو) ڕیزکراون.

ئەگەر ئەو ئەنجامە لە هاوکێشەیەکدا دابڕێژین، ئەم شێوەیەی خوارەوەمان دەست دەکەوێت:

(ڤێ) «ب ب – ب ب – ب ب – ب ب –» = «ب ب ـَ ب ب ـَ ب ب ـَ ب ب ـَ»

لە خوێندنەوەدا

لەم هاوکێشەیەوە دەتوانین ڕاستییەکی گرنگ دەستنیشان بکەین. هاوکێشەکە دووپاتی دەکاتەوە ئاستەکانی کێش و ڕیتم لەم جۆرە شیعرەدا: (شیعری کێشراو)، بەشێوەیەک ئاوێتەن جیاکردنەوەیان وەکو کارێکی بێ هوودەی لێ دێت.

ئەگەر سەرنجی بەشی لای ڕاستی هاوکێشەکە بدەین (کە وێنەی خاڵی یەکەمی تیۆریەکەیە)، دەبینین لە سیستێمێکی دیاریکراوی بڕگەیی پێکهاتووە: (بڕگەیەکی درێژ بەدوای دوو بڕگەی کورتدا).

بەرامبەر بەو، واتە بەشی لای چەپی هاوکێشەکە (کە وێنەی خاڵی دووەمی تیۆریەکەیە)، هەمان سیستێمی بڕگەیی دەبینین، بەڵام بەو جیاوازییەی هەر بڕگەیەکی درێژ سترێسێکی بەسەرەوەیە.

بۆ ئەوەی بتوانین لە هەردوو ئاستی کێش و ڕیتمی نموونە (ڤێ) نزیکتر ببینەوە، دەبێ وەکو نموونەی کێشێکی دیاریکراو تەماشای بکەین.

(ڤێ ١) ب ب –/ ب ب –/ ب ب –

ئەگەر هەرسێ بڕگە لە نموونەکە، لە هەنگاوێکی شیعریدا کۆ بکەینەوە، بەشی یەکەمی هاوکێشەکە ئەم وێنەیە پێک دەهێنێت:

(ڤێ ٢) ب ب–/ب ب–/ ب ب–/



ئەمەش وێنەی کێش (مەجزووئی موتەدارەکی مەخبوون)ی عەرووزییە بەشی دووەمی هاوکێشەکە، ئەم وێنەیەمان پیشان دەدات:
ئەمەش وێنەی کێش (ئەنابیستی سێ هەنگاوی)ی ئینگلیزییە.
«سیستێمی نووسینی ئینگلیزی لە نموونەکەدا ڕەچاو نەکراوە».

بەگوێرەی تیۆرییەکەی (ڤایل)، دەبێ (ڤێ ١) شیعرێکی تەواو نەبێت؛ چونکە مەرجی خاڵی دووەمی تێدانییە کە لە (ڤێ ٢)دا هەیە. ئەمەش یەکێکە لە ئەنجامە زیانبارەکانی تیۆریەکە، لە هەمان کاتیشدا دژایەتیی (ڤایل) لەگەڵ خۆیدا. ڕەنگە ئەم خاڵەی دوایی، بتوانێ لایەنێکی گرنگ لە کەموکوڕی تیۆریی عەرووزیش ڕوون بکاتەوە؛ چونکە عەرووزانەکان لە ڕێگای ئەم چەشنە نەخشە تیۆرییانەوە: (بازنە عەرووزییەکان)، شیعریان شی دەکردەوە، بۆیە ئاوڕیان تەنیا لە ئاستی کێش دەدایەوە؛ (هاوکاتیی تەفعیلەکان) و ئاستی ڕیتمیان بەتەواوی پشتگوێ دەخست کە لە نموونەکەدا لە ڕێگای دووبارەبوونەوەی بڕگەیەکی درێژ لە پاش دوو بڕگەی کورتدا دروست دەبێت. کەواتە، نموونە (ڤێ ١)، بەتایبەتی ئەگەر ئەدگاری زمانی عەرەبیش ڕەچاو بکەین کە بەرامبەرێتی بڕگە کورت و درێژەکان سەرەکیترین دیاردەیەتی، دێڕێکی کێش و ڕیتم تەواوە.

هەر نموونەی (ڤێ ١)، ئەگەر لە دۆخێکی شیعریدا ئینگلیزێک بیخوێنێتەوە، بەهۆی زاڵبوونی دیاردەی سترێس وەکو ئەدگارێکی سەرەکیی زمانەکەی، هەمان داڕشتنی (ڤێ٢)ی پێ دەبەخشێت.

هەرچەند تیۆریەکە ئاستەکانی کێش وڕیتم بەو شێوەیە ئاوێتە دەکات، بەڵام بەبێ داگرتنی (ڤایل) لەسەر ڕوودانێکی ڕێکی (سترێس)، یان هەر دیاردەیەکی دیکەی زمان، تارمایی سنوورێکی وردی لە نێوان ئەو دوو ئاستەدا لە پشتی وشەکانییەوە شاردۆتەوە.

١- ٣-٢ تیۆریەکەی (هال) و (کایزەر):

«شیعری کێشراو لە هەموو جیهاندا وەکو سەما و گۆرانی و شێوەکاری، لە دراوەکانی ڕۆشنبیریی جیهانین. شیعری کێشراو نەخشەیەکی ڕووتی لە دەقێکی دیاریکراودا هەیە کە گەلێ جار زۆر سادەیە:

١- ط ط ط ط ط ط

هەندێ جار درێژیی زنجیرەکە بەگوێرەی یاسایەکی سادە دەگۆڕێت، وەکو:

٢- ط ط ط ط ط

ط ط ط ط ط

هەندێ جاریش درێژی و سیستێمی زنجیرەکە بەم شێوانەی خوارەوە دەگۆڕین:

٣- ط د ط د ط د ط د

٤- ط د ط د ط د ط د ط د ط د

٥- د ط د د ط د د ط د د ط د

«نیشانە ڕووتەکان سەر بەئاستێکن پێی دەوترێت (بنیاتی قووڵ)، ڕەگەزەکانیش کە برگەی زمانن سەر بەئاستی (بنیاتی سەرەوە)ن.

گواستنەوە لە بنیاتی قووڵەوە بۆ بنیاتی سەرەوە بەگوێرەی چەند یاسایەک بەڕێوە دەچێت پێیان دەوترێت (یاساکانی جێبەجێکردن)». [٣٤]

ئەم تیۆرییە، بەپێچەوانەی تیۆریەکەی (ڤایل)، لە ئاستێکی گشتی ترەوە لە سیستێمە ڕیتمییەکان دەڕوانێت. دەتوانین ئەم دوو جۆرەی خوارەوە لە تیۆرییەکە دەربێنین:

(ئەلف) سیستێمە ڕیتیمییە سادەکان.

(بێ) سیستێمە ڕیتمییە لێکدراوەکان.

زنجیرە ڕیتمییەکانی (١، ٢)ی تیۆریەکە، لە جۆری یەکەمن، نموونەکانی (٣، ٤، ٥)یش لە جۆری دووەمن.



بۆ ئەوەی بتوانین لە سروشتی پێکهاتنی سیستێمەکان بگەین، پێویستە بنیاتی برگەییان دەستنیشان بکەین، بۆ ئەم مەبەستەش هەر نیشانەیەکی (ط) بەبرگەیەکی کورت و هەر (د) ێکیش بەبرگەیەکی درێژ دادەنێین.

لە زنجیرەی ژمارە (١)ی تیۆریەکەدا، دەبینین دێڕەکە لە (٦) نیشانەی (ط) پێکهاتووە. ئەگەر وەکو شیعرێک هەڵیسەنگێنین، دەبێ بڵێین شیعرێکی (٦) برگەییە. نموونەکە هیچ دیاردەیەک نانوێنێت یارمەتی وەسفێکی وردتری بدات، هەر هەوڵدانێکیش بۆ دەستەکردنی ژمارەیەک لە برگەکان لە هەنگاوی هاوکاتدا، لەلایەنی کێشی شیعرەکەوە هەمان ئەنجامی دەبێت. کەواتە لە بارەی ئەم نموونەیەوە دەتوانین ئەوەندە بڵێین شیعرێکی هاوکێشە، کێشەکەشی (٦) برگەییە. بەڵام داڕشتنێکی وا لە ئاخاوتنی هەموو زمانێکدا هەیە، ئەگەر نموونەکەش دێڕە شیعرێک بێت نەک ڕستەیەکی سادە، دەبێ (مۆسیقا)کەی لە کوێدا بێت؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە، دەبێ بۆ ئەدگاری سەرەکیی زمانەکە بگەڕێین بۆ ئەوەی سروشتی برگەکان دیاری بکات، مەحاڵیشە زمانێک ئەدگارێکی سەرەکیی نەبێت فۆنەتیکەکەی بەشەقڵی خۆی مۆر بکات. کەواتە جگە لە کێش، پێویستە بۆ بنیاتی ڕیتمەکەش بگەڕێین.

جگە لە ئەنجامەی سەرەوە، زنجیرەی ژمارە (٢) جیاوازییەکی دیکەی لەگەڵ نموونەی یەکەمدا هەیە. ئەم نموونەیە، وەکو تیۆرییەکە بۆی دەچێت تەنیا لە درێژیدا گۆڕاوە، بەدەربڕینێکی دیکە، سیستێمی زنجیرەکە هەر خۆیەتی. بەڵام لە سیستێمە ڕیتمییە سادەکاندا، هەر گۆڕانێکی ژمارەیی، کار لە بنیاتی سیستێمەکە دەکات و تەنیا کێشەکەی ناگۆڕێت. بۆیە بنیاتی مۆسیقایی دێڕە شیعرێک، تەنیا کێشەکەی- واتە هاوژمارەیی برگەکان- دەستنیشانی ناکات، بەڵکو لە پێش هەموو شتێکدا سروشتی ئەو برگانە: (کورتی و درێژییان، بەهێزی و بێ

هێزییـان، پلەکـانی ئاوازە دارییـان، سیـسـتێـمی وەسـتانەکان... هتـد) دیاری دەکات– (یاساکانی جێبەجێکردن بەگوێرەی تیۆریەکە).

بەو شێوەیە هەر گۆڕانێک لە ژمارەی بڕگەکاندا کاردەکاتە سەر بنیاتی ڕیتمیی شیعرەکەش، وەکو گۆڕینی مەڵبەندە ڕیتمییەکان و خاوی و خێرایی لە مۆسیقای شیعرەکەدا، ئەمیش کار لە چەندێتیی بڕگەکان دەکات.

تیۆرییەکە، کاتێ ئاماژە بۆ زنجیرەکانی (٣، ٤، ٥) دەکات، باس لە گۆڕانی (سیستێم)ەکان دەکات، ئەمەش دەیسەلمێنێت گۆڕانکارییەکانی (١، ٢) بنەڕەتی نین.

ئەگەر لە زنجیرەکانی (٣، ٤، ٥) ورد بینەوە، دەبینین ڕەگەزێکی جیاواز دەرکەوتووە لە چۆنیەتیدا وەکو (ط) نییە؛ چونکە سیستێمێکی ڕیتمیی جیاوازی بەنموونەکانی پێشوو بەخشیوە، کە لە ڕێگای بەدوایەکدا هاتنی بڕگەیەکی کورت و بڕگەیەکی درێژ (یان هەر ئەدگارێکی دیکەی زمانەکە) دروست بووە. هەمان پێوەندی لە نێوان بڕگە کورت و درێژەکاندا، یان بەهێز و بێ هێزەکاندا لە نموونەکانی (٤، ٥)یشدا دووبارە بوونەتەوە.

ئەو جیاوازییەی لەنێوان هەردوو سیستێمەکەدا دەیبینین، بەڕای ئێمە بۆ بنیاتی قووڵ دەگەڕێتەوە؛ چونکە ئەو بنیاتە، بەو یاسا تیۆریانەی بۆ سیستێمی نموونەکان داڕێژراوە، ئەو خاڵەی پشتگوێ خستووە کە گۆڕانکارییەکانی گواستنەوە بۆ بنیاتی سەرەوە، کە لە ڕێگای یاساکانی جێبەجێکردنەوە کار دەکەن، لە کاتی جێبەجێکردندا زۆربەی ئەو جیاوازیانە وەلا دەنێن سنوور بۆ سیستێمەکان دەکێشن.

ئەو شیکردنەوەیە، دەمانگەیەنێتە ئەو ئەنجامە، کە دابەشکردنی سیستێمە ڕیتمییەکان بەسەر (سادە) و (لێکدراو)دا، زۆر لەگەڵ ڕاستیدا ناگونجێت.



### ١- ٣- ٣: تیۆرییەکەی (جاک ڕۆبو) و (پییێر لۆسن):

«هەر تیۆریەکی ڕیتم لە چەند یەکەیەکی جیا دەکۆڵێتەوە کە بەگوێرەی چەند ئاستێکی ڕێکخراو کۆدەکرێنەوە، لە ڕوانگەی لێکچوون و جیاوازیشەوە لێیان دەڕوانرێت»[٣٥].

تیۆریەکە، وەکو (حەرەکات) شیی دەکاتەوە، وێنەیەکی دەقاو دەقی تیۆرییەکەی (ڤایل) مان پیشان دەدات: کۆبوونەوەی چەند بڕگەیەک لە چەند هەنگاوێکدا، سەرنجدانی کورتی و درێژی، یان بەهێزی و بێ هێزیی بڕگەکان لە هەنگاوەکاندا.

ئێمە هەوڵ دەدەین (یەکێتی)ی تیۆرییەکە، کە تەنیا سیستێمێکی دیاریکراوی ڕیتمی دەستنیشان دەکات، هەڵوەشێنین و هەر ئاستێکی بەقۆناغێکی گەشەکردووی شیعری جیهانی دابنێین، هەرچەند نازانین دانەرانی تیۆریەکە لە کاتی داڕشتنیدا تا چ ڕادەیەک بیریان لە بارێکی وای تیۆریەکەیان کردۆتەوە. بەڵام ڕێبازێکی وا، کە هەندێ جار زانا بایۆلۆژییەکان لە چوارچێوەی زانستی سروشتیدا بەشێوەیەکی ئاسایی بەکاری دەهێنن: (بەستنەوەی مێژووی پەرەسەندنی زیندەوەران، بەقۆناغەکانی گەشەکردنی کۆرپەلەوە– بەنموونە). ڕێبازێکی وا، سوودێکی بەرچاو بەتێگەیشتنی سیستێمە جۆراوجۆرەکان دەگەیەنێت.

تیۆرییەکە ئەم سێ ئاستەی خوارەوەی هەیە:

١– یەکە جیاوازەکان.

٢– ئاستە ڕێکخراوەکان.

٣– لێکچوون و جیاوازیی یەکەکان.

لە ئاستی یەکەمدا، تیۆرییەکە لە چەند یەکەیەکی جیا دەکۆڵێتەوە، کە لە شیعردا دەبنە چەند بڕگەیەکی جیا (کورت– درێژ، بەهێز– بێ هێز، پلەکانی ئاوازە... هتد). لەم ئاستەدا چەندێتی و چۆنێتی بڕگەکان دەستنیشان نەکراون، بەگوێرەی تیۆرییەکە بریتین لەو کەرەسە خامانەی

لە ئاستی دووەمدا هەر زمانە و بەگوێرەی ئەدگارە سەرەکییەکەی خۆی کەسایەتییان پێ دەبەخشێت. کەواتە ئاستی یەکەم ئەم وێنەیەی خوارەوەی هەیە:

(جیم پێ) «ب ب- ب--»

لە ئاستی دووەمدا، ئەو برگە جیاوازانەی ئاستی یەکەم، لەچەند یەکەیەکی گەورەتردا کۆدە کرێنەوە: (هەنگاو)، پێکهاتنی کۆبوونەوەکانیش لە بچووکترین شێوەی کۆبوونەوەدا دەبێت: (٢، ٣). ئێستا ئەم ئاستەش لە وێنەیەکدا تۆمار دەکەین: (جێم پێ١) «ب ب/ -ب/ --»

بە گوێرەی ئاستی سێیەمی تیۆرییەکە، دەبێ لە گۆشەی لێکچوون، یان جیاوازییەوە لە یەکەکانی ئاستی دووەم بڕوانرێت.

بە پێچەوانەی ئاستەکانی دیکەوە، ئەم ئاستە لە تاکە نموونەیەکدا دانارێژرێت؛ چونکە لەم ئاستەدا پێویستە ئەدگارەکانی ئەو زمانەی شیعرەکەی پێ وتراوە، ڕەچاو بکرێت: (پلەی سترێس، ئاوازە... هتد).

ئەگەر وەکو شیعرێکی (چەندی) تەماشای نموونە (جیم پێ ١) بکەین، ناتوانین بەشیعرێکی کێشراوی بژمێرین، چونکە هەنگاوەکانی هاوکێش نین، کەواتە، بۆ ئەوەی وەکو شیعرێک هەڵی سەنگێنین پێویستە دووبارە ڕەچاو بکەین:

(ئەلف) هەر لە سەرەتاوە برگەکان بەجۆرێک ڕیز بکرێن هاوکێش بن، یان:

(بێ) لە کاتی خوێندنەوەدا ئەو جیاوازییانە چارەسەر بکرێن.

لە هەردوو بارەکەشدا، یەکێک لە وێنە شیاوەکانی (جیم پێ ١) نموونەیەکی وەکو ئەمەی خوارەوە دەبێت:

(جیم پێ ٢) «ب -/ ب -/ ب -»

ئێستا پرسیارێکی بەجێ خۆی دەسەپێنێت: کام یەک لە نموونەکانی



(جیم پێ ١) و (جیم پێ ٢) وێنەی بنەچەیی شیعرەکەن؟.

وەڵامدانەوەیەکی دروستی ئەو پرسیارە، گەلێ دەستکەوتی تیۆری و پراکتیکی دەبێت.

هەموو شیعری جیهانی لەم ڕوانگەیەوە دەکرێن بەدوو بەشەوە:

شیعرێک لەگەڵ نموونەیەکی نەخشەکێشراودا دەگونجێ و شیعرێک لەگەڵ ئەو نموونەیەدا ناگونجێت. بەگوێرەی ئەم بۆچوونە، هەر یەکێک لە نموونەکانی (جیم پێ ١، جیم پێ ٢) سەر بەسیستێمێکی ڕیتمیی جیاوازن. لە هەمان کاتیشدا، هەر یەکێک لەو دوو نموونەیە وێنەی بنەچەیی سیستێمەکەی خۆیەتی.

ئەم هەڵێنجانە سەرەتاییە، ئەنجامێکی مێژوویی گرنگی لێ دەبێتەوە:

هەموو ئەو شیعرانەی سەر بەسیستێمی (جیم پێ ١)ن، لە ئەدەبیاتی جیهانیدا بەشیعری (فۆلکلۆری) ناسراون، شیعرەکانی سەر بەسیستێمی (جیم پێ ٢) ش، بەشیعری سیستێمی (قاڵبی) پۆلینکراون. ئێستا باسەکە دوو لقی دیکەی لێ دەبێتەوە:

(تێ) پۆلینکردنەوەی هەموو بەرهەمی شیعری جیهانی لەسەر بناغەی ئەو دوو سیستێمە بۆ دەستنیشانکردنی مێژووی ڕاستەقینەی بەرهەمهێنانیان.

(جیم) دەستنیشانکردنی ئاستەکانی کێش و ڕیتمی هەردوو سیستێمەکە.

لەم باسەدا بەدوای شیکردنەوەی بابەتەکانی خاڵی (تێ)دا ناڕۆین، ئەو خاڵە پێوەندیی ڕاستەوخۆی بەباسەکەمانەوە نییە، بەڵام بوارێکی فراوان لە بارەی بەراوردکردنێکی مێژوویی بەرهەمە شیعرییەکانەوە ئاوەڵا دەکات. ئێستا دەمانەوێ بزانین ئاستەکانی کێش و ڕیتمی نموونە (جیم پێ ٢) چۆن دەستنیشان دەکرێن.

بە گوێرەی ئاستی سێیەمی تیۆرییەکە، لە گۆشەی لێکچوون و

جیاوازییەوە لە یەکەکانی ئاستی دووەم دەڕوانرێت. ئەگەر سەرنجێکی دیکەی نموونە (جیم پێ ٢) بدەین دەبینین لە سێ یەکەی دوو بڕگەیی پێکهاتووە، بڕگەکانیش یەکەمیان و دووەمیان درێژە. ئەم سیستێمی بڕگە بەندییە، دوو دیاردەی لە نموونەکەدا بەدیهێناوە:

(یەک) هاوکێشیی هەنگاوەکان.

(دوو) سیستێمێکی ڕیتمی کە پێوەندیی نێوان بڕگە کورت و درێژەکان دروستی کردووە، ئەم ئاسانییە لە دەستنیشانکردنی هەردوو ئاستی نموونەکەدا بەئەندازەی یەکەم بۆ ئەو سیستێمە تیۆرییە دەگەڕێتەوە کە پێش دانانی شیعرەکە داڕێژراوە، بەلام نموونە (جیم پێ ١) تاقیکردنەوەیەکی گرانتری دەوێت.

ئەگەر لە ڕوانگەی هاوکێشیی هەنگاوەکانەوە سەرنجی نموونە (جیم پێ١) بدەین، زۆر بەزەحمەت دەتوانین بیر لەوە بکەینەوە لە خوێندنەوەدا (یان لە هەر ڕێگایەکی دیکەوە) ئەو هەموو ناکۆکییەی نێوان هەنگاوەکان چارەسەر بکەین. ڕەنگە لە زمانێکدا (ستریس)، یان (ئاوازە) ئەدگارێکی سەرەکی بێت، بتوانرێت بەکزی بیر لە شتێکی وا بکرێتەوە، بەلام تەنانەت لەو دۆخەشدا سەربەستیی زمانەکە بێ سنوور نییە. کەواتە لە پێناوی چارەسەرکردنی ناکۆکیی نێوان سروشتی زمانەکە و پێویستییەکانی (شیعرییەتی) نموونەکە، دەبێ سەربەستییەکی پتر بەزمانەکە بدرێت، سەربەستییەکی واش تەنیا لە ڕێگایەکەوە دەبەخشرێت: تێکدانی ئەو سنوورانەی بڕگەکانیان لەت کردووە، ئەم ئەنجامەش هەنگاوێک بەرەو پاش دەمانگێڕێتەوە، واتە بەرەو نموونە (جێم پێ) کە سەر بەئاستی یەکەمی تیۆرییەکەیە.

لە سەرەتادا، با لە ئاستی کێشی نموونەکە بگەڕێین: وەکو لە پێشدا ئاماژەمان بۆ کرد، نموونەکە لە (٦) بڕگە پێکهاتووە و هیچ سیستێمکی دیاریکراو بۆ ڕیزکردنیان ڕەچاو نەکراوە. هەر هەوڵدانێکیش بۆ سەپاندنی سیستێمێکی وا بەسەریاندا، دەبیاتە خانەی سیستێمی نموونە



(جیم پێ ٢) وەوە. کەواتە ئاستی کێش لە نموونەکەدا مەودای دێڕە شیعرەکە هەموویەتی.

ئیستا، پێویستە سەرنجی لایەنی گرنگی بابەتەکە بدەین کە نموونەکە لە هەر داڕشتنێکی دیکەی نا شیعریی زمانەکە جیا دەکاتەوە، واتە ئاستی ڕیتمەکەی. بۆ ئەو مەبەستەش، دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوەمان لەبەر چاو بێت:

١- سروشتی (بڕگە) لەو زمانەدا کە شیعرەکەی پێ وتراوە، ئایا لەو زمانانەیە بڕگەکانیان بەگشتی کورتن، یان جیاوازی لەنێوان بڕگە کورت و درێژەکانیاندا هەیە؟ یان، بڕگەکانیان سترێسدارن، لەم دۆخەشدا دەستووری سترێسبەندییان بە چ جۆرێکە؟... هتد.

٢- سیستێمی (وەستانەکان) لە شیعرەکەدا. ئایا وەستانی شیعرین، یان وەستانی سیمانتین؟ دەستنیشانکردنی سروشتی وەستانەکان لەم سیستێمەدا تۆزێ بەئاسانی خۆی بەدەستەوە دەدات؛ چونکە ئەگەر وەستانی شیعری بەزۆری بەسیستێمی یەکەمەوە بەسترابێت کە نموونە نەخشەکێشراوەکە پێشەکی دەستنیشانی دەکات:

(لەتکردنی وشەکان و دابەشکردنیان بەگوێرەی سیستێمی هەنگاوەکان)، ئەوا لەم سیستێمەدا ئاستی سیمانتی، وەستانەکان دیاری دەکات. کەواتە بۆ دۆزینەوەی بنیاتی نموونەکە، پێویستە پێڕەوی لەم دوو خاڵەی خوارەوە بکەین:

١- دەسکاری نەکردنی بنیاتی بنەچەیی بڕگەکان.

٢- ڕەچاوکردنی لایەنی سیمانتی، بۆ دەستنیشانکردنی جێگای وەستانەکان.

هەرچەند تیۆرییەکە لە ڕوانگەی دانەرانییەوە، یەکەیەکی جیانەکراوەیە، بەلام ئەو سەرنجە سەرپێیانەی پێشوو، بی هەڵوەشاندنی ئاستەکانی تیۆریەکە مەیسەر نەدەبوون. ئەنجامە گشتیەکانی تیۆرییەکە، لە کەرتی داهاتوودا باس دەکرێن.

١-٤: چنینی ئەنجامەکان:

هەڵسەنگاندنەکانی کەرتی پێشوو، دوو جۆرە ئەنجامیان لێ هەڵدەوەرێت: جۆرێکیان ئەنجامی تایبەتین کە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆیان بەبابەتە باس لێکراوەکانەوە هەیە. ئەو جۆرەیان لە جێگای خۆیدا ئاماژەی بۆ کرا، لێرەدا دووبارە ناکرێتەوە.

جۆری دووەمی ئەنجامەکانی، کە لەم کەرتەدا باس دەکرێت، ئەو ئەنجامە گشتیانەن وا یەکسەر دەچنە نێوەرۆکی باسەکەوە.

١- ٤-١: پێناسەکانی دەستەی یەکەم، کە کێش بەوێنەیەکی تایبەتیی ڕیتم دادەنێن، لەگەڵ یەکێتییاندا لەو ڕەگە گشتییەدا، ئەم دوو لقەی خوارەوەیان لێ دەبێتەوە:

(یەک) لقی سەرەکی: (ئەریستۆ، زانا موسڵمانەکان) و هاوبۆچوونەکانیان، کە پێیان وایە کێش ئەدگاری سەرەکیی جیاکردنەوەی شیعر و پەخشانە.

لێرەدا، هەرچەند لە سەرەتادا کێش و ڕیتم لە ئاستە گشتییەکەی (شیعر- پەخشان)دا لە یەکتر جیادەکرێنەوە، بەڵام لە ئاستی ڕووتی شیعردا، لەو وێنە ڕیتمییەدا کۆدەکرێنەوە کە دەتوانرێت بە(ڕیتمی کێشراو) پێناسە بکرێت. ئەو وێنەیەش لە دووبارەکردنەوەی ژمارەیەکی دیاریکراوی (یەکە)ی هاوکات، لەم هاوکێشەی خوارەوەدا خۆی دەنوێنێت:

(ئەلف زێ) کێش (ڕیتم لە شیعردا)= هاوژمارەیی (یەکە) هاوکاتەکان. بەگوێرەی ئەو هاوکێشەیە، شیعر لە دەرەوەی کێشدا بوونی نییە.

(دوو) لقی لاوەکی: (ریچاردز، کۆپلاند)، هەرچەند لە چوارچێوەی کێشەوە لە ڕیتم دەڕوانن، بەڵام کێش بەلای ئەمانەوە هۆکاری سەرەکیی ڕیتم نییە، تاقیکردنەوەی شیعریش پتر (واتا) دیاریی دەکات.



ئەم بۆچوونە، بەتوندی کار لە بنیاتی ڕیتمیی شیعر دەکات؛ چونکە خوێندنەوە بەگوێرەی (واتا)، سیستێمی (وەستان)ەکانی شیعر دەجووڵێنێت کە کێش دەستنیشانی دەکات.

هەرچەند نوێنەرانی ئەم بۆچوونە هەوڵیان نەداوە پەرە بەو ئەنجامە گرنگەی دارشتنەکانیان بدەن، بەڵام بۆچوونەکانیان ڕێگا بۆ گەشەپێکردنێکی دیکە خۆش دەکات کە لە (ڕووسیا)وە سەری هەڵدابوو.

فۆرمالیستەکان لەو ڕاستییەوە لە شیعر دەڕوانن کە کێش ئەدگاری هەموو شیعری جیهانی نییە، بەڵکو ڕیتم وەکو ڕەگەزێکی سەرەکی، لە ڕێگای کارلێکردنی ئاستە جۆراوجۆرەکانی زمانی شیعرەوە بنیاتی شیعر پێک دەهێنێت. بەڵام ئەمە بەو واتایە نییە کێش هیچ بایەخێکی نامێنێ، لێرەدا نەرمتر و سەربەستانەتر ڕەفتاری لەگەڵدا دەکرێت.

کێش، کە لە بۆچوونەکانی لقی یەکەمدا وێنەیەکی نەگۆڕاوی کۆمەڵە سیستێمێکی دەنگی بوو، لێرەدا شاعیر لە دوو ئاستەوە ڕەفتاری لەگەڵدا دەکات: ئاستێکیان یاسا و دەستوورە لە پێش دیاریکراوەکانی کێشن کە دەبێ پێڕەوییان لێ بکرێت، ئاستی دووەمیشیان لەو گۆڕانکارییەدایە زمانی ڕۆژانە بەسەر ئەو دەستوورانەدا دەیسەپێنێت.

ئەو هاوکێشەیە لە نێوان «ڕێزمانی» کێش و «ڕەوانبێژیی» ڕیتمدا، بەگوێرەی دەربڕینەکەی (پ. گیرۆ)، بواری بناغەیەکی نوێ بۆ پۆلینکردنەوەی شیعر دابین دەکات کە (جاکۆبسن) لەم نموونانەی خوارەوەدا دایاندەڕێژێت:

١- شێوەی دێڕە شیعر: بریتییە لەو کێشەی لە دێڕێکی دیاریکراودا دەینوێنێت.

٢- نموونەی دێڕە شیعر: بریتییە لە ئەنجامی ئەژمارەیی هەموو دێڕەکانی شیعرەکە، یان کێشەکەی.

٣- شێوەی وتن: بریتییە لە جۆری خوێندنەوەی دێڕە شیعرێک.

٤- نموونەی وتن: بریتییە لە نموونەی هاوبەشی چەند خوێندنەوەیەک لەلایەن کەسێکەوە، یان کۆمەڵێکەوە[٣٦].

پۆلینکردنەکەی (جاکۆبسن) بەتەواوی لەگەڵ ئەو ئەنجامەدا ڕێک دەکەوێت تاقیکردنەوەکانی شێوەی خوێندنەوەی شیعر سەلماندوویانە:

«دێرە شیعرێک بەدەگمەن لەگەڵ کێشەکەیدا بەتەواوی ڕێکدەکەوێت.

ئەو گۆڕانانە لە کێشەکاندا، نەک کێشەکان خۆیان، جوانیی شێوەی شیعر دەنوێنن»[٣٩].

١- ٤-٢: هەرچەند (پەخشانە شیعر) بەدووپاتکردنەوەی زاراوەی (ڕیتمی ناوەوە)، جێگای بەکێش- وەکو ڕەگەزێکی زاڵ و پێویست لە شیعردا لەق کرد، بەڵام ئەو زاراوەیە بەگوێرەی ئاگادارییی ئێمە، نەیتوانیوە ناکۆکیی نێوان نارێکی پەخشان و ڕێکخراویی شیعر لەو بەرهەمە هاوبەشەیاندا ڕوون بکاتەوە. سەرەڕای ئەوەش، پێناسەیەکی دیاریکراوی بۆ سروشتی ئەو ڕیتمەی لە شیعری کێشراودا هەیە، لەگەڵ ئەو ڕیتمەی لە (پەخشانە شیعر)دا کاردەکات، دانەڕشتووە. ئایا جیاکردنەوەی (ڕیتمی ناوەوە) و (ڕیتمی دەرەوە) ئەوە ناگەیەنێت نوێنەرانی پەخشانە شیعریش هەردوو ئاستی کێش و ڕیتم تێکەڵ دەکەن؟

ڕەنگە ئەنجامی تیۆرییەکانی ڕیتم، وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە.

١-٤-٣

(ئەلف) تیۆرییەکەی (ڤایل)، هەرچەند لە سەرەتاوە ئاستەکانی کێش و ڕیتم تێکەڵ دەکات، بەڵام وەکو لە جێگای خۆشیدا وتمان، تارماییی جیاکردنەوەیەکی شاراوەی تێدا دەبینرێت.

یەکێک لەو بۆچوونە گرنگانەی لەسەر بنچینەی تیۆرییەکەی (ڤایل) دامەزرێنراون، داڕشتنەکەی (مەندووز)ە لە بارەی جیاکردنەوەی ئاستەکانی کێش و ڕیتم لە شیعری عەرەبیدا.



ئەو لە ئەنجامی شیکردنەوەکانی چەند نموونەیەک لە عەرووزی عەرەبیدا، بۆ ئەوە دەچێت هاوکێشیی هەنگاوەکان بەتەنیا ناتوانێ ڕیتمی شیعرەکە دەرخات؛ چونکە ئەوە تەنیا کێشی شیعرەکەیە. بۆ دەستنیشانکردنی ڕیتمەکەی پێویستە سەرنجی دیاردەیەکی دەنگی بدرێت لە چەند جێگایەکی دیاریکراوی شیعرەکەدا دووبارە دەبێتەوە: (خاڵی دووەمی تیۆرییەکەی ڤایل)، ئەو جێگایانەش بریتین لەو بڕگانەی سترێسی سەرەکی هەڵدەگرن. بەو شێوەیە:

کێش= هاوکێشیی یەکە هاوکاتەکان.

(ڤێ میم

ڕیتم= دووبارە بوونەوەیەکی ڕێکی دەنگێک لە یەکە هاوکاتەکاندا.

ئەمەش بەو ئەنجامەی دەگەیەنێت ڕیتم بەو جۆرە پێناسە بکات:

«بریتییە لە گەڕانەوەی دیاردەیەکی دەنگی لە کاتی چوونیەکدا. ئەگەر سێ جار لە شتێکت دا و لە جاری چوارەمدا ئەو لێدانەت بەهێزتر بوو، بەدووبارە کردنەوەی ئەو کارە ڕیتم دروست دەبێت، لەوانەشە تەنیا لە بێ دەنگیی پاش هەرسێ لێدانەکە دروست بێت»[٣٧].

(بێ) تیۆرییەکەی (هاڵ) و (کایزەر) دوو سیستێمی شیعری دەستنیشان دەکات: یەکەمیان سادەیە و بەگوێرەی تیۆریەکە شیعرێکی کێشراوی بێ ڕیتمە دووەمیشیان لێکدراوە و هەردوو ئاستەکەی تێدایە.

بەڵام ئەو دابەشکردنە پتر لە ڕوانگەی سیستێمە پێوانەیییەکانەوە لە جۆری یەکەم دەڕوانێت؛ چونکە سیستێمی یەکەمیش ئەدگارەکانی سیستێمی دووەمی تێدایە (بە جۆرێکی دیکە).

(تێ) دوا تیۆری: تیۆرییەکەی (ڕۆبۆ) و (لۆسن)، هەرچەند بەگشتی وەسفی سیستێمی شیعرە ڕێکخراوەکان دەکا، بەڵام جیاکردنەوەی ئاستەکانی بەچەند ئەنجامێکی گەیاندین کە هەندێکیان باسکران و لێرەدا ئاماژە بۆ ئەو دابەشکرنە دەکەین وا شیکردنەوەی تیۆرییەکە بەردەستی دەخات.

وەکو لە شیکردنەوەی تیۆرییەکەدا دەرکەوت، دابەشکردنی نموونەکانی شیعری جیهانی لەسەر بنچینەی شیعری قالّبی و شیعری فولکلۆری، گەلێ لە دابەشکردنەکەی (هال- کایزەر) دروستترە. ئەم دابەشکردنە، ئەو سادەییە لەسەر شیعری فۆلکلۆری لا دەبات کە لە هەموو جێگایەکدا کێش و ڕیتمی تایبەتی خۆی هەیە[٣٨].

١-٥: ئێستا هەوڵ دەدەین هەندێ زانیاریی پێویست پێشکەش بکەین، کە پتر بەکەڵکی لێکۆڵینەوەیەکی لەوە قووڵتر دێن وا لێرەدا کراوە.

گیروگرفتی بۆچوونە جۆراوجۆرەکانی، وەکو لە باسەکانی ئەم فەسڵەدا دەرکەوت، لە دوو خاڵدا کۆ دەبێتەوە:

١- جیانەکردنەوەی ئاستەکانی کێش و ڕیتم و دانانی کێش بەوێنەیەکی تایبەتیی ڕیتم، لەلایەن بۆچوونەکانی دەستەی یەکەمەوە.

٢- نەتوانایی بۆچوونەکانی دەستەی دووەم لە دەستنیشانکردنێکی دیاریکراوی وردی سروشتی ڕیتم لە دەرەوەی کێشدا.

١- ٥-١: وەکو هەوڵدانێک بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە و ئەو دوای لایەنەکان، لە دەروازەی نموونەیەکی ئاشنای کوردەوارییەوە هەوڵی داڕشتنی پەیکەری گشتیی بابەتەکە دەدەین.

زۆربەمان دەزانین وشەی (ئەستێڵ) چی دەگەیەنێت: ئەو ئامرازی ئاودانەی هەزاران ساڵە وەرزێری کورد دایهێناوە و بەکاری دەهێنێت.

دەمانتوانی، وەکو مرۆڤێکی سەردەمی سەدەی بیستەم بیر دەکاتەوە، نموونەیەکی هاوچەرخانەتر بەکار بێنین: (سیستێمی کارکردنی هەر مۆتۆرێکی دیزل، یان بەنزین، کە لە سادەترین کتێبی میکانیکی ئۆتۆمبیلدا دەست دەکەوێت)، بەڵام ئەو سادەیی و سرکی و کێویلەییەی (شیعرایەتی)ی شیعر پێک دەهێنن، لە نموونەیەکی سەرەتایی و لە هەمان کاتیشدا ڕێکخراوی وەکو (ئەستێڵ)دا پتر دەرکەوێت. هەرچەند (ئەستێڵ) بەگوێرەی سیستێمێکی سادە کاردەکات، بەڵام مێژووی



داهێنان و گەشەکردنی، باس لە چەند قۆناغێکی جیاواز دەکات.

ئەم وێنەیەی خوارەوە، نموونەی سادەترین جۆری (ئەستێڵ)ە، کە بۆ دابینکردنی سێ سیستێمی ئاودان بەکار دێت:

(تێبینی: لەگەڵ هەر بەشێکی وێنەکەدا، زاراوە و جۆر و بەشەکانی شیعر تۆمار دەکرێن)




نەخشەی (١-١): ئاستەکانی کێش و ڕیتم.

وێنەکە بەئەندازەیەک ڕوونە پێویست بەڕوونکردنەوەی پتر ناکات، بەڵام سیستێمی دێراوەکان چەند سەرنجێکیان دەوێت.

ئەگەر سەرنجی سیستێمی ژمارە (١) بدەین، دەبینین لەو دێڕاوانەیە سیستێمی (پڕبوون – بڕین)یان هەیە، واتە دێڕاوێک پڕ دەبێت ئەمجا ئاوەکەی لێدەبڕێت و دەخرێتە سەر دێڕاوێکی دیکە. ئەم سیستێمە زۆر لە سیستێمی شیعری ستوونی دەچێت کە دێڕێک تەواو دەبێت و دەبڕێت و دێڕێکی نوێ بەهەمان سیستێم دەست پێدەکات.

لە سیستێمی ژمارە (٢)دا، کە بە(دێڕۆغە) دەناسرێت، ئاوەکە دەخرێتە سەر دێڕاوی یەکەم و ئەوانی دیکە لە ڕێگای یەکدییەوە پڕ دەبن. ئەم سیستێمە زۆر لە دینامیزمی شیعرە سادەکان دەچێت: (شیعری فۆلکلۆری) کە بۆ دەستپێکردنی دێڕەکان پێڕەوی لە سیستێمێکی دیاریکراو ناکرێت.

سیستێمی ژمارە (٣) وێنەیەکی جیاوازی لە دوو سیستێمەکەی پێشووتر هەیە، لێرەدا زەوییەکە بێ ڕێکخستن بەسەر چەند (دووکان)ێکدا دابەشدەکرێت و ئاوەکە بەسەربەستی دەخرێتە سەر پارچەکان.

سادەترین بەراوردکردنی ئەم سیستێمە لەگەڵ جۆرێکی شیعردا، زۆربەی شیعرە پەخشانئامێزەکان بیر دەخاتەوە. لە ڕاستیدا بەراوردکردنی سیستێمەکانی وێنەکە و جۆرەکانی سیستێمی ڕیتم لە شیعردا بەرفراوانە، چەند بەشێکی ئەو لایەنانە لە فەسڵەکانی داهاتوودا لێیان دەکۆڵێتەوە.

ئێستا هەندێ سەرنجی گشتی لە بارەی کێش و ڕیتمەوە تۆمار دەکەین:

(ئەلف) ڕیتم: لە وێنەکەدا، ئەستێڵەکەمان بە(مێشک – المخ) و ئاوەکەی نێویشیمان بە(بیرکردنەوە) داناوە. کە ئاوەکە لە کونی ئەستێڵەکە دێتە دەرەوە: (ڕاز) ئەوا بەناو جۆگەکەدا: (زمان – اللغە) بەرەو سیستێمی دێڕاوەکان دەڕوات. لەم دۆخەدا، ئاوەکە هیچ شێوەیەکی دیاریکراوی نییە (جگە لە شێوەی جۆگەکە)، واتە زمان بەهەموو



ئاستەکانییەوە و بێ هیچ تەگەرەیەک کار دەکات.

سیستێمی ئاخاوتن چەمکێکی گەلێ ئاڵۆز و فراوانی هەیە، لێرەدا بواری شیکردنەوەی ئاستەکانیمان نییە، بۆیە تەنیا ئاماژە بۆ ئاستەکان دەکەین:

١- ئاستی دەنگسازی. ٢- ئاستی وشەسازی. ٣- ئاستی ڕستەسازی.

جیاکردنەوەی ئاستەکان- کە لێرەدا لە بچووکەوە بۆ گەورە پۆلینکراوە- تەنیا بەمەبەستی ڕوونکردنەوەیە، ئەگینا ئاستەکان پێوەندییەکی نەپچڕاویان لە نێواندایە. لەم ڕوانگەیەوە، دەتوانین پێناسەیەکی ڕیتم بکەین ئەو سروشتەی پێشووی ڕەچاو کردبێت:

(ئەلف میم) ڕیتم (لەشیعردا)= کۆ سیستێمی ئاستەکانی زمان[٣٩].

(بێ) کێش: لە هەمان وێنەی ئەستێڵەکەدا، دەبینین ئاوەکە بەگوێرەی شێوەی دێڕاوەکان: (کێش) دەجووڵێت. لێرەدا ئاوەکە هەر ئەو (ئاو)ەیە لە جۆگەکاندایە: (ڕیتم)، بەڵام شێوەی بزووتنی گۆڕاوە.

کەواتە لە شیعریشدا، ڕیتم هەر (سیستێمی ئاخاوتن)ە، بەڵام شێوەکانی جێبەجێکردنی گۆڕانیان بەسەردا دێت.

لەو ڕوانگەیەوە، کێش لە بری ئەوەی (وێنەیەکی تایبەتی ڕیتم بێت) وەکو بۆچوونەکانی دەستەی یەکەم پێناسەی دەکەن و هەر شیعری کێشراو ڕەچاو دەکات، یان (ڕیتمی دەرەوە) بێت و ئەگەر شیعرێک ئەو ڕەگەزەی تێدا نەبوو ئەوا شیعرێکی کێشراو نەبێت، لەبری ئەو بۆچوونانە کێش بەم شێوەیەی خوارەوە پێناسە دەکرێت:

(بێ میم) کێش= سیستێمی کارکردنی ڕیتم.

بەگوێرەی ئەم پێناسەیە، هەموو جۆرەکانی شیعر کێش و ڕیتمی خۆیان هەیە، کە بریتییە لەو (سیستێمەی) ڕیتم لە ڕێگایەوە کار دەکات.

١- ٥-٢ ڕەنگە قووڵبوونەوە لە نێوەرۆکی (ئەلف میم، بێ میم) و

وردتر بەراوركردنی سیستێمی (ئەستێل) لەگەڵ جۆرەكانی سیستێمی شیعردا، هەندی ئەنجامی پێچەوانەیان هەبێت، ڕەنگە بۆچوونی واش هەبێت لێرەدا باس كراوە و ئێمە ئاگامان لێی نییە.

لە هەمـــوو بارێكدا، لێكۆڵینەوەی وردتر و قـــووڵتـــر دەتوانێت ناكۆكییەكان چارەسەر بكات. تا ئەو دەمەش لایەنەكان ڕوون دەبنەوە، یان بتوانرێت لە ڕێگای لێكۆڵینەوەی پترەوە ئاسۆی بابەتەكە فراوانتر بكرێتەوە، لە شیكردنەوەكانی داهاتوودا پێڕەوی لە كامڵترین پێناسەكانی كێش و ڕیتم دەكەین- بەتایبەتی نموونە «ڤێ میم)، (١-٤-٣) »- كە لەم فەسڵەدا هەڵسەنگێندران.

١- ٥-٣: ئەو بنەڕەتە تیۆرییانەی شیكردنەوەكانی داهاتوو لە چوارچێوەیاندا دەبزوێن، لەم خاڵانەی خوارەوە بریتین:

١) كێش، وەكو تەرازوویەكی پێوانەكردنی بڕگەیی، بەئاستی ڕووتی توانایە، لە هەموو بارێكدا ئاماژە بۆ هاوژمارەیی بڕگەكان دەكات.
٢) ڕیتم، وەكو چالاكییەكی سیمانتی سەر بەئاستی جێبەجێكردنە، ڕستە زمانییەكان تەنیا لە ڕێگای ڕیتمەوە لە دەستە دەنگییەكاندا كۆدەكرێنەوە و كەسایەتیی مۆسیقایی دێڕەكان بەرجەستە دەكەن.
٣) لە ڕوانگەی خاڵی (١)ەوە، (كێش) سەر بەئاستی نووسینەوەیە.
٤) لە ڕوانگەی خاڵی (٢)ەوە، (ڕیتم) سەر بەئاستی خوێندنەوەیە.

بەو شێوەیە، بۆ دەستنیشانكردنی ئاستەكانی (كێش) و (ڕیتم) لە دێڕە شیعرێكدا، دەبێ دوو دۆخ ڕەچاو بكرێت، بۆ نموونە:

(ئەلف) كە دەڵێین دێڕە شیعری (میم نوون) شیعرێكی كێشراوە، ئەو وەسفە دێڕە شیعری (نوون میم)یش دەگرێتەوە، هەرچەندە هێڵی ڕیزبوونی (یەكە) ڕیتمییەكانییان هەمان پێكهاتنی ئاسۆییان نییە. ئەم دۆخە سەر بەئاستی ژمارە (٣)ی سەرەوەیە.

(بێ) جیاوازیی نێوان نموونە (میم نوون) و (نوون میم) لەو



ئاستەدایە خاڵی ژمارە (٤)ی سەرەوە پیشانی داوە، لە ڕاستیشدا ئەو دۆخە، پێوەری جیاكردنەوەی دووسیستێمی جیاوازە.

---

(١) مختارات من الادب الافريقي، ص٢٠.
لە ڕوانگەی فەلسەفییەوە، بابەتەكە زۆر لەو وەسفە قووڵترە.
ڕیتم لەم ڕوانگەیەوە ئەو یەكێتییە بەرجەستە دەكات كە (كار) وەكو پێوەندییەكی بەهێزی نێوان بەرهەمی داهێنراو و نەخشە ئایدیاییەكەی ئەو بەرهەمە لە چوارچێوەی (كات)دا دەینوێنێت. بڕوانە: غیورغی غاتشیف، الوعی والفن، عالم المعرفه، العدد (١٤٦)، ص ١٦١، هەرچەندە ناتوانرێت دوور لە تیۆرییە ئایدیاییەكەی (ئیفلاتۆن) لەو بۆچوونەی (گاچێڤ) بڕوانرێت، بەڵام بەستنەوەی جەمسەرەكانی هاوكێشەكە بەڕەگەزی (كار)ەوە، لە دژایەتییە میتافیزیكییەكەی تیۆرییەكەی (ئیفلاتۆن) ڕزگاری كردووە.
(٢) فن الشعر، ل٥.
لە زۆربەی ئەو هونەرانەدا كە (ئەریستۆ) لە بواری ئەنجامدانی كاری لاساییكردنەوە لە ڕێگای (ڕیتم، زمان، تەبایی)یەوە ئاماژەی بۆ كردوون، ڕیتم بەتەنیا، یان لەگەڵ دوو ڕەگەزەكەی دیكەدا، لە هەموویاندا بەشدارە.
(٣) میادین علم النفس، ص٤٩٠، ٤٩٢.
(٤) مقدمة في ادب العراق القديم، ص٥٤.
لێرەدا پێویستە بگوترێت بۆچوونێكی وا، شیعر ناكات بەپاشكۆی گۆرانی؛ چونكە گۆرانی تەنیا كار لە ڕیتمی دەرەوەی شیعرەكە دەكات، لەكاتێكدا ڕیتمی ناوەوەی، ئەدگارەكانی زمان دیاریی دەكەن.
(٥) زمانەوانی، ل١٣.
(٦) محاولة في اصل اللغات، ص٧٢.
(٧) ئەو دوو دەستكەوتەی فەلسەفەی فیتاگۆری، ڕۆڵێكی یەكجار بنەڕەتییان لە بواری كێش و ڕیتمی شیعردا گێڕا. (ئەریستۆ) ئەدگاری پێوانەیی ژمارەكان بۆ دیاریكردنی سنووری شیعر و پەخشان بەكار دەهێنێت. لە پێش ئەویشدا، (ئیفلاتۆن) توانیبووی لە ڕێگای كۆمەڵە مۆسیقاییەكانی (ئۆكتاف (١: ٢، كوارت ٣: ٤، كوینت ٢: ٣)وە، جۆرەكانی ڕیتم و جیاكردنەوەی (هەنگاو)ەكانی شیعر بەوردی دەستنیشان بكات.

بڕوانە: اوفسيلينكۆف، سمير نۆڤا، موجز تأريخ النظريات الجمالية، الطبعة الثانية، بيروت، ١٩٧٩، ص١٢-١٣.
هەروەها پەیژە مۆسیقاییە وردەکەی (فیتاگۆرس)، لە: الارموی، کتاب الادوار تحقیق هاشم الرجب، بغداد، ١٩٨٠، ص٥٢.

(٨) نظرية الادب، ص١٧٠.

(٩) الجمهورية، ص٩٣.

(١٠) الخطابة، ص٢١٢.

(١١) رسالة الكندى، ص٦٧-٦٨.

(١٢) الموسيقى الكبير، ص١٠٨٥.

(١٣) فصل من كتاب الشفاء، الخطابة ص١٦١.

(١٤) پێویستە لەم بوارەدا خاڵێکی یەکجار گرنگ ڕوون بکرێتەوە: وەکو زانراوە (کێش)، هەر لە (ئەریستۆ)وە بەتاکە ئەدگارێکی شیعر دانەنراوە؛ چونکە تەنیا لەگەڵ ئەندێشەدا دەتوانێت ماهییەتی شیعر دەستنیشان بکات. بۆیە پێویستە ئەو خاڵە لە یاد بێت، کاتێ کێش بەتاکە پێوەرێکی جیاکردنەوەی دوو جۆرە وتەی ئەندێشە سازی وەکو شیعر و پەخشان، دادەنێین. بۆ زانیارییەکی پتر لەم بارەیەوە، بڕوانە: د. ألفت كمال، نظرية الشعر عند الفلاسفة المسلمين، الطبعة الاولى، بيروت، ١٩٨٣، ص٢٣١ و لاپەڕەکانی دواتر.

(١٥) مبادئ النقد الادبى، ص٣.

(١٦) سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٨.

(١٧) سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٢.

(١٨) سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٦.

(١٩) كيف نتذوق الموسيقى، ص٥٤. لە هێڵێکی هاوتەریب لەگەڵ دارشتنەکەی (کۆپلاند)دا، (ئەلیزابێت درۆ) ئاستێکی فراوانتر بەپێوەندیی نێوان (ڕیتم- واتا) دەبەخشێت. بەلای ئەمەوە ناتوانێت مۆسیقایەکی دیاریکراو بۆ دێڕە شیعرەکان دیاری بکرێت. تەنانەت لە سنووری تاکە کێشێکیشدا، بەهۆی جیاوازیی خوێندنەوە وە بەزەحمەت بڕیار دەدرێت دوو شاعیر هەمان کێش بەکار دەهێنن.
بڕوانە: اليزابيث درو، الشعر كيف نفهمه ونتذوقه، ترجمه محمد ابراهيم الشوش، بيروت، ١٩٦١، ص٥٠-٥٣.



(٢٠) نظرية الادب، ص١٧٦.

(٢١) نقد النقد، ص٢٤.

(٢٢) البنية الايقاعية لشعر حميد سعيد، ص١٠.

(٢٣) الثقافة الاجنبية، ص ٩.

(٢٤) نظرية البنائية في النقد الادبي، ص ٧١.

(٢٥) بەگوێرەی ئەو بۆچوونەی لە کۆتایی ئەم فەسڵەدا پەرەی پێدەدەین و تێیدا ئاستی کێش بەتەواوی لە ئاستی ڕیتم دادەبڕین، هەموو شیعرێک، تەنانەت پەخشان- ئامێزترینیان، کێش و ڕیتمی خۆی دەبێت.

(٢٦) الاديب المعاصر، ٦-١٨.

(٢٧) ناوی کتێبەکە بەعەرەبی: (قصيدة النثر من بودلير الى ايامنا)یە، کە تا ئێستا نەکراوە بەعەرەبی، هەرچەندە لەلایەن (ئەدۆنیس)و کۆمەڵەی (شیعر)ەوە، بەشێوەیەکی فراوان دەخوێندرایەوە و سوودی لێ وەردەگیرا، بەڵام لەم دواییەدا دوو فەسڵی لێ وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، یەکەمیان لە نامیلکەیەکی سەربەخۆدا بەناونیشانی (جمالية قصيدة النثر)ەوە، دووەمیشیان لە گۆڤاری (الاديب المعاصر)دا، هەردووکیشیان لەلایەن (د. زهير مجيد مغامس)ەوە کراون بەعەرەبی، لەم نامەیەشدا سوودیان لێ وەرگیراوە.

(٢٨) جماليه قصيده النثر، ص٢٣.

(٢٩) الاديب المعاصر، ص٢٣.

(٣٠) افق الحداثه وحداثه النمط، ص٩٨.

(٣١) الاديب المعاصر، ص٩٣.

(٣٢) فى البنيه الإيقاعيه للشعر العربى، ص٤٠٢.

(٣٣) الثقافه الاجنبيه، ص٢٧.

(٣٤) كتاب العروض، ص٢٠-٢١.

(٣٥) سەرچاوەی پێشوو، ل١٩.

(٣٦) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢.

(٣٧) فی المیزان الجدید، ص١٨٠.

(٣٨) هەرچەند ئەو دابەشکردنە هەنگاوێکە بەرەو تێگەیشتنێکی قووڵتر لە بارەی سیستێمە ڕیتمییەکانەوە، بەڵام تەنیا شیعرە کێشراوەکان دەگرێتەوە. ئەمەش سەرەڕای کەموکوڕییەکانی دیکەی دابەشکردنە دوو لقەکان، هەموو جۆرە شیعرە بەخشان- ئامێزەکان پشتگۆی دەخات، کە دێرینترین جۆری شیعری جیهانین. بۆ دەستنیشانکردنێکی نزیکتری و سیستێمانە، بڕوانە پاشکۆی ژمارە (١)ی ئەم نامەیە.

(٣٩) بۆ داڕشتنەوەیەکی وردتری چەمکەکانی کێش و ڕیتم لە ڕوانگەی پێوەندییەکانی نێوان ئاستەکانی زمانەوە، دەتوانین لەسەر بنچینەی بۆچوونەکانی (سۆسۆر: زمان- ئاخاوتن) و (چۆمسکی: بنیاتی قووڵ- بنیاتی سەرەوە)، نەخشەی پرۆژەیەکی تەواوی بکێشین.

جیاکرنەوەی دوولایەنی زمان لەلایەن (سۆسۆر)ەوە: لایەنی سەرەکی (کۆمەڵایەتی)، کە بوونێکی سەربەخۆی لە قسەکەر هەیە و لە هەموو ئەدگارەکانیدا سایکۆلۆژییە، لایەنی لاوەکی، کە ئاستی ئاخاوتنە و کۆمەڵە ئەدگارێکی سایکۆلۆژیکیی هەیە (علم اللغة العام، ص ٣٧)، بناغەیەکی بابەتی بۆ جیاکردنەوەی ئاستەکانی (کێش) و (ڕیتم) دادەمەزرێنێت. بەڵام ئەو جیاکردنەوە سەرەتایی و گرنگە، پێویستیی بەدیاریکردنێکی دروستی قۆناغەکانی ئاڵۆگۆڕکردن هەیە کە لەنێوان ئاستەکانی (زمان- ئاخاوتن)دا ڕوو دەدەن. لەم بوارەشدا، چەمکەکانی پێکهێنەرە دەنگسازی و ڕستەسازی و واتا سازییەکانی (تیۆریی بەدیهێنان و گۆڕین- النظریة التولیدیة التحویلیة)ەکەی (چۆمسکی)، یارمەتییەکی ئەزموونگەری پێشکەش دەکەن، بەگوێرەی ئەوە، پێکهێنەری ڕستەسازی، بۆ هەر ڕستەیەک (ڕستەی شیعریش) دووبنیات پێک دەهێنێت: بنیاتێکی قووڵ، کە چەمکە واتا سازییەکەی دیاری دەکات و بنیاتی سەرەوە، کە چەمکە دەنگسازییەکەی دەستنیشان دەکات (جوانب من نظریە النحو، ص ٣٩). بەو شێوەیە، زەمینەیەکی بابەتی بۆ پۆلینکردنی (کێش) لە خانەی (زمان بنیاتی قووڵ) و (ڕیتم) لە خانەی (ئاخاوتن- بنیاتی سەرەوە)دا فەراهەم دەبێت.

## فەسڵی دووەم

### سەرەتایەکی پراکتیکی بۆ پۆلینکردنەوە

پۆلینکردنی بۆچوونەکان.

٢-١ هەڵسەنگاندنی هەندێ لە پێناسەکان.

٢-٢ کێشی خۆماڵی لە ڕوانگەی کێشی برگەیی (ژاپۆنی)یەوە.

٢-٣ کێشی خۆماڵی و کێشی برگەیی (فەرەنسی)

٢-٤ عەرووز و کێشی خۆماڵی.

٢-٥ ئاوڕێکی پێچەوانە بەرەو مێژوو.

**پۆلینکردنی بۆچوونەکان:**

ئەم فەسڵە، بەگشتی، شەقڵێکی بەراوردکاریی دەبێت. لێرەدا کێشی خۆماڵی لە ڕوانگەی چەند کێشێکەوە بەراورد دەکرێت پتر بۆچوونە کوردییەکان ناڕاستەوخۆ لەبەر کارتێکردنی میکانیزمی ئەواندا دەجووڵێنەوە. دەستکەوتی ڕاستەوخۆش، دەبێ پۆلینکردنێک بێت لەسەر بنچینەی شیکردنەوەی ئەو بۆچوونانە، لە ئاستی نموونە تیۆرییەکانی سیستێمی ڕیتمیی ئەو کێشانەدا دامەزرابێت.

دەتوانین لە ڕووی سیستێمی کێشەوە، بۆچوونەکان لە سێ دەستەدا پۆلین بکەین:

(ئەلف) ئەو بۆچوونانەی بڕگە بە(یەکە)ی سەربەخۆ دادەنێن:

(شێخ نووری، د. خەزنەدار- بەنموونە). دیارترین نموونەی شیعری جیهانی ئەم سیستێمە کێشەی هەبێت، شیعری (ژاپۆنی)یە.

(بێ) ئەو بۆچوونانەی (هەنگاو- Mesure)، وەکو لە شیعری (فەرەنسی)دا بەکاردێت، بە(یەکە)ی سەربەخۆ دادەنێن:

(گۆران- وەکو دیارترین نموونەی ئەم بۆچوونە).

(تێ) ئەو بۆچوونانەی (تەفعیلە)ی عەرووزی، نزیکترین نموونەیانە: (سەجادی، هەردی، ژیر).

کە باس لە (یەکە)ی سەربەخۆ دەکرێت، لە پێش هەموو شتێکدا جۆری ئەو یەکەیە دەستنیشان بکرێت: (یەکەی کێش)، یان (یەکەی ڕیتم).

زنجیرەی ئاخاوتن، وەکو دەزانین، لە کۆمەڵێک (یەکە)ی دەنگی پێک دێت بە(بڕگە) ناسراوە. ئەم پرۆسێسە لە شیعریشدا ناگۆڕێت، بەڵام لێرەدا دوو دەستوور ڕەچاو دەکرێت:

(یەک) پاراستنی هەمان ژمارەی بڕگە لە هەردوو نیوە دێڕی شیعرەکەدا.



(دوو) جۆری ڕیزکردنی بڕگەکان.

دەستووری یەکەم، وەکو ئەدگارێکی شیعری کێشراو، لە هەموو شیعری جیهانیدا ڕەچاو دەکرێت (١-٣-٢). لەم ڕوانگەیەوە، (یەکە)ی کێش لە هەموو جۆرەکانی شیعری کێشراوی جیهانیدا (بڕگە)یە، هەر لێرەشەوەیە دەتوانین هەموو شیعرێکی وا، بەگوێرەی ژمارەی بڕگەکانی دەستنیشان بکەین.

دەستووری دووەم، پێوەندیی بەجۆری ڕیزکردنی (یەکە)کانی کێشەوە هەیە کە هەر زمانێک بەگوێرەی ئەدگارەکانی خۆی ڕیزیان دەکات، ئەو یەکانە لە یەکەی گەورەتردا کۆدەکرێنەوە: (یەکەی ڕیتم).

سیستێمی (یەکە) ڕیتمییەکان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دی دەگۆڕێت، ئەم گۆڕانەش سیستێمێکی ڕیتمی لەوی دیکە جیا دەکاتەوە.

جیا نەکردنەوەی ئەو دوو (یەکە)یە، گەلێ ئەنجامی زیانباری تیۆری و پراکتیکیی لێ دەکەوێتەوە: لە تیۆریدا دەبێتە هۆی تێکەڵکردنی ئاستەکانی کێش و ڕیتم، لە پراکتیکیشدا سنووری ڕیتمیی نێوان سیستێمە جیاوازەکان تێک دەدات. کەواتە پێش ئەوەی ئاوڕ لە لایەنە پراکتیکییەکان بدەینەوە، زۆر پێویستە لایەنی تیۆری لە هەندێ پێناسە کوردییەکاندا یەکلایی بکرێتەوە.

٢-١ هەڵسەنگاندنی هەندێ لە پێناسەکان:

بەرامبەر بەو جووتبوونە تەواوەی لە پێشەکیدا لە بواری پۆلینکردنی کێشی خۆماڵیدا بینیمان، نەخشەیەکی یەکجار ئاڵۆز و هەمەجۆر لە پێناسەکانی کێش و ڕیتم- هەرچەندە (کێش) بەچەمکە (ئەریستۆ)ییەکەی زۆربەیانی داپۆشیوە- بەرچاو دەکەوێت.

لێرەدا یەک یەکی پێناسەکان شی ناکەینەوە، بەڵکو ئەم سێ پێناسەیەی خوارەوە، وەکو بەردەبازێک بۆ باسەکانی داهاتوو، هەڵدەسەنگێنین[1]:

- پێناسەکەی (شێخ نووری) (١٩٢٦).
- پێناسەکەی (مەعروف بەرزنجی) (١٩٥٨).
- پێناسەکەی (کامیل بەسیر) (١٩٨٣).

٢-١-١ کـێش بەلای (شـێخ نووری)یەوە «تەرازووی ئاهەنگە». بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانیشی دێڕە هۆنراوەیەکی خۆی:

سوبحەینێ ئەم تەجەددودە بۆ تۆیە ئەی شەباب
بۆ تۆیە ئەی ئومێدی وەتەن خادیمی حەیات

هەڵدەوەشێنێتەوە، بۆ ئەوەی پیشانی بدات تەنیا لە ڕێگای ئەو تەرازووی ئاهەنگەوە لە پەخشان جیا دەبێتەوە[٢].

ئەگەر لە ئاستی (یەکە) کانی کێشەوە لە شیعرەکە بڕوانین، دەبینین هەر نیوە دێڕیکی لە (١٤) بڕگە پێکهاتووە:

(شین)

| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سوبـ | حەیـ | نێ | ئەم | تە | جەد | دو | دە | بۆ | تۆ | یە | ئەی | شە | باب |
| بۆ | تۆ | یە | ئەی | ئو | مێـ | دی | وە | تەن | خا | دیـ | می | حە | یات |
| – | – | ب | – | ب | – | ب | ب | – | – | ب | – | ب | –ە |

کەواتە، دەتوانین بڵێین کێشی نموونە (شین)، (١٤) بڕگەییە. بەگوێرەی ئەو بۆچوونە، دەتوانین گەلێ وێنەی جیاواز لە نموونەکە، بەڵام بێ گۆڕینی (واتا) و ڕێژەی بڕگەکان، پێک بهێنین و بەهەمووشیان بڵێین (١٤) بڕگەیی، ئەم وێنەیەی خوارەوە جۆرێکی نموونەکەیە:

(شین١)

| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ | ١٠ | ١١ | ١٢ | ١٣ | ١٤ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەی | شە | باب | سوبـ | حەیـ | نێ | ئەم | تە | جەد | دو | دە | بۆ | تۆ | یە |
| – | ب | – | – | – | ب | – | ب | – | ب | ب | – | – | ب |
| ئەی | خا | دیـ | می | حە | یات | ئو | مێـ | دی | وە | تەن | بۆ | تۆ | یە |
| – | – | ب | – | ب | – | ب | – | ب | ب | – | – | – | ب |



وەکو دەبینین (شین ١) لە هەمان واتا و ژمارەی بڕگەیی (شین) پێکهاتووە، کەوا بێت جیاوازییان لە چیدایە؟

وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە، پێوەندیی بەئاستی دووەمی شیعرەکە- واتە سیستێمی بنیاتە مۆسیقاییەکەیەوە- هەیە.

ئەگەر لەڕووی سیستێمی ڕیز بەستنی بڕگەکانەوە لە نموونە (شین) ورد بینەوە، دەبینین هەردوو نیوە دێڕەکەی هەمان سیستێمیان هەیە، واتە جۆری خوێندنەوەی دێڕی یەکەمی وەکو جۆری خوێندنەوەی دێڕی دووەمیەتی، ئەو یەکێتییە لە خوێندنەوەدا، یەکێتییەکی «ئاهەنگی» لە نێوانیاندا پێک دەهێنێت کە لەنێوان هەردوو نیوە دێڕی (شین ١)دا، بەهۆی جیاوازیی سیستێمی ڕیز بەستنی بڕگەکانیانەوە دەبێ پێک نەیەت، لە هەمان کاتیشدا دەبێ شیعر نەبێت.

ئاهەنگی نموونە (شین)، ڕیتمی ئەو کێشەیە لە عەرووزی نەتەوە نا عەرەبەکاندا بە(موزاریعی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور) ناسراوە.

(یەکە) کانی کێش لەو جۆرەدا، لەم (یەکە) ڕیتمییانەی خوارەوە لەگەڵ ناوەکانیاندا کۆ دەبنەوە:

(شین٢) مەفعوولو / فاعیلاتو / مەفاعیلو / فاعیلان
--ب / -ب-ب / ب--ب / -ب-ە

ئەوەش وێنە تیۆرییەکەی ئەو پێناسەیەیە (شێخ نووری) لە «تەرازووی ئاهەنگ» مەبەستێتی.

بەو شیوەیە، دەگەینە ئەو ئەنجامەی «تەرازووی ئاهەنگ» پێناسەی (ڕیتم - الایقاع) دەکات نەک (کێش- الوزن)؛ چونکە هاوکێشیی هەردوو نموونەی (شین، شین ١)، نەبوو بەهۆی هاوڕیتمییان کە نموونە (شین ٢) پیشانی دەدات. گرنگیی ئەم ئەنجامە لە سیستێمی شیعری بڕگەییدا پتر دەردەکەوێت.

٢-١-٢: لە پەنجاکانی ئەم سەدەیەدا، ئەو دەمەی لاپەڕەکانی (شەفەق) مەودایەکی بەرچاویان بۆ لێکۆڵینەوە شیعرییەکان تەرخان دەکرد، نووسەرانی وەکو (مەعروف بەرزنجی، مارف خەزنەدار، ئیحسان فوئاد، ڕەفیق حیلمی... هتد) بایەخێکی تایبەتییان بەبابەتی کێش دەدا (ئوسلووب- وەکو زۆرجار بەکار دەهێنرا-). بەڵام ئەو بابەتە، هەر لە پێناسەکەی (شێخ نووری)یەوە- وەکو بینیمان- تا ئەو ساڵانە، لەگەڵ ڕیتم: (مۆسیقا)ی شیعردا ئاوێتە دەکران. لەبەر ئەوە، بۆچوونێکی وردی وەکو ئەوەی (د. خەزنەدار) لە پێشەکیی (دیوانی سەلام)دا پێشانی دابوو[٣]، پێویست بوو وەکو هاریکارییەکی بەرپرس بۆ جیاکردنەوەی ئەو دوو ئاستە، لەلایەن ڕەخنەی کوردییەوە بەگەرمی پێشوازیی لێ بکرایە. بەڵام دەبینین نووسەرێکی وەکو (مەعرووف بەرزنجی)، لە هەوڵدانێکدا بۆ گێڕانەوەی ئاستەکان بۆ خولگەی پێشوویان، هەڵوێستێکی پێچەوانە لە بۆچوونەکەی (د. خەزنەدار) دەگرێت.

(بەرزنجی) هەڵوێستەکەی خۆی لەسەر بنچینەی بەراوردکردنی دوو نموونەی «هەڵپەڕکێ و سەما» و «ڕۆیشتن» بنیات دەنێت، کە بەلای ئەوەوە یەکەمیان کێشی هەیە و دووەمیان نییەتی. ئەو بەراوردکردنە بەم ئەنجامەی دەگەیەنێت: کێش لە پێویستییەکانی شیعرە و لە مۆسیقا جیا نییە[٤].

ئەگەر لە دەروازەی هەردوو نموونەکەوە لە پێناسەکە بڕوانین، دەبینین بابەتەکان ئاوەژوو لێکدراونەتەوە.

هەڵپەڕکێ و سەما بەئەندازەی یەکەم هونەرێکی ڕیتمین و ڕەگەزی کێش تێیاندا زۆر بەکەمی ڕەچاو دەکرێت، (ئەریستۆ)ش هەر لە زووەوە ئاماژەی بۆ ئەو ئەدگارەی (سەما) کردووە[٥].

بە پێچەوانەشەوە، ڕۆیشتنی ئاسایی جووڵانەوەیەکی کێشراوە، کێشەکەشی لە دووبارەبوونەوەی دوو هەنگاوی هاوسەنگ دروست



دەبێت، لەبەر ئەم هۆیەش ڕیتمی تێدا نییە. بۆ ڕوونکردنەوەیەکی پتر، ئەگەر سەرنجی ڕۆیشتنی مرۆڤێکی شەل بدەین (لەگەڵ عوزر خوازیدا)، لەم دۆخەدا ڕۆیشتنەکە کێش و ڕیتمیش دروست دەکات کە بریتین لە دووبارە بوونەوەی دوو هەنگاو: (کێشەکەی)، یەکێکیان سووکە: (لاقە ساغەکە)، ئەوی دییان قورسە: (لاقە شەلەکە) (ڕیتمەکەی).

لێرەوە دەردەکەوێت کێش لە پێویستییە بنبڕەکانی شیعر نییە، تەنانەت لە مۆسیقاشدا، کە مەیلێکی پتر بەلای هاوکاتیی (بار)ە کاندا پیشان دەدات، کێش مەرجی ڕیتم نییە[٦].

٢- ١-٣: ئەو زەمینەیەی (د. کامیل بەسیر) بۆچوونەکانی خۆی لەسەر شی دەکاتەوە، تا دوا پلە دروستە. بەڵام هەر ئەوەندە هەنگاوی یەکەمی دەنێت، ئیتر بابەتەکان لە سروشتی خۆیان دەردەچن.

(د. بەسیر) لەسەرەتادا لە دوو ئاستی «ئاوازی هۆنراوەی دیوی دەرەوە»و«ئاوازی هۆنراوەی ناوخۆیی»یەوە لە مۆسیقای شیعر دەڕوانێت.

ئەم دەسپێکردنە بابەتییە، بەپۆلینکردنێکی ڕیتمی دەرەوە دوایی پێ دێت کە بابەتی شیعرەکە بەجۆری ئەو کێشەوە دەبەستێت وا لەگەڵیدا دەگونجێت[٧].

ڕاستە لێکۆڵینەوە تازەکان لە سەلماندنی پێوەندیی نێوان بابەتی شیعر و بنیاتە مۆسیقاییەکەی زۆر نزیک بوونەتەوە، بەڵام ئەو پێوەندییە، بەو واتایە نییە هەر بابەتێک لەگەڵ کێشێکی تایبەتیدا ڕێک دەکەوێت، بۆچوونێکی وا دیسان شوێنەواری داڕشتنەکانی (ئەریستۆ)یە[٨].

ئەو هەڵوێستە (د. بەسیر)ی تووشی تاقیکردنەوەیەکی دژوار کردووە.

ئەو، بۆ سەلماندنی ڕێککەوتنی کێشە کورتەکان لەگەڵ باری شادیدا، شیعرێکی حەوت بڕگەیی بەنموونە دەهێنێتەوە[٩]، کەچی چەند لاپەڕەیەک پێش ئەمە، باس لە «تابلۆ پڕ لە خەفەت و پەژارە و ئێش و ئازارە» کەی (دیلان) دەکات کە بۆ مەرگی هاوڕێیەکی هۆنیوێتیەوە،

کێشی هۆنراوەکەش هەر حەوت بڕگەییپە[١٠].

وەکو دەبینین، ئەو جۆرە بۆچوونانە مۆسیقای شیعرەکە لە زمان دادەبڕن و وەکو ڕەگەزێکی سەربەخۆ بەکێشەوە دەیبەستنەوە.

شیعرەکانی (مەولەوی)، کە هەموو مەبەستەکانیان لە کێشی دە بڕگەییدا داڕێژراون، لەم بوارەدا بەڵگەیەکی بەهێز پێشکەش دەکەن.

ئەو تێکەڵکردنە، لە باسی «ئاوازی ناوخۆیی هۆنراوە»دا، ڕوونتر دەردەکەوێت. (د. بەسیر) لەم ئاستەدا ئاماژە بۆ سێ دیاردە دەکات کە لە بابەتەکانی ڕەوانبێژیی کۆنن: (ڕەگەز دۆزی – الجناس، دژیەک – الطباق، وشەی دەنگ ئاوازدار – الفصاحە).

ئەو سێ ئاستە، لە ڕاستیدا سەر بەئاستێکی شیعرن پتر پێوەندیی بەدەنگسازییەوە هەیە، نووسەرێکی وەکو (ڕینێ ویلیک)یش هەر سێکیان لەژێر ناونیشانی (ڕەوانی– السلاسە)دا چارە سەردەکات.

ئەمە جگە لەوەی بەشەکانی هەرسێ ئاستەکە– وەکو دەنگ– زۆرجار لەگەڵ چەمکی (قافیە)دا، کە بەزۆری سەر بە«ئاوازی دەرەوە»یە، بەیەکدا دەچن.

«ئاوازی هۆنراوەی دیوی دەرەوە» وەکو (د. بەسیر) پیشانی دەدات، لە ڕاستیدا پێوەندیی بەئاستی «ئاوازی هۆنراوەی ناوخۆیی»یەوە هەیە.

٢-٢ کێشی خۆماڵی لە ڕوانگەی کێشی بڕگەیی (ژاپۆنی)یەوە:

لە پێش باسدا ئاماژەمان بۆ زاراوە گواستنەوەیەکی میکانیکیانەی لایەنەکانی کێشی (تورکی) لە ڕێگای (شێخ نووری)یەوە کرد. بەگوێرەی ئەو بۆچوونە، دەبێ لە شیکردنەوەی نموونەکەی (شێخ نووری)دا، پشت بەکێشی بڕگەیی (تورکی) ببەستین، بەڵام کارێکی وا ڕووبەڕووی دوو بەربەست دەبێت:

(ئەلف) ئەو زانیارییانەی لە بارەی ئەو کێشەوە لەبەر دەستماندان، سەرەڕای کەمییان، لە چەند وەسفێکی ئاشنای وەکو: «شیعری تورکی



شیعرێکی بڕگەییە و بۆ شیتەڵکردنەوەی کێشەکەی پەنجە بەکار دەهێنرێت لەبەر ئەوە کێشی ژمارەی پەنجەشی پێ دەوترێت» تێپەرناکات.[١١]

(بێ) پێناسەی کێشی بڕگەیی، وەکو (شێخ نووری) دەیخاتە ڕوو، تەنیا ژمارەی بڕگەکان ڕەچاو دەکات، ئەمەش پتر کێشێکی بڕگەیی ڕووتەڵی وەکو کێشی (ژاپۆنی) دەگرێتەوە. کێشی بڕگەیی (تورکمانی) وەکو (بەندەر ئۆغلو) باسی دەکات، وێنەیەکی دەقاو دەقی ئەو کێشە خۆماڵییانەیە لە نووسراوە کوردییەکاندا ئاماژەی بۆ دەکرێت: (حەوت بڕگەیی= ٤+٣، ٣+٤)، (هەشت بڕگەیی= ٤+٤)، (یانزە بڕگەیی= ٤+٤+٣، ٧+٤) و... هتد[١٢]. کەواتە بەراوردکردنی نموونەکەی (شێخ نووری)، یان هەر نموونەیەکی فۆلکلۆریی دیکە لەگەڵ نموونەکانی شیعری (تورکی)دا، هیچ جیاوازییەک لە شیکردنەوەی باوی کێشی خۆماڵیدا دەرناخات. بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٤).

٢- ٢-١ سادەترین نموونەی شیعری بڕگەیی (ژاپۆنی)، لە جۆری (تانکا)یە. بە گوێرەی پۆلینکردنی تیۆرییە ڕیتمییەکەی (هال- کایزەر، ١- ٣- ٢) ئەم وێنەیەی خوارەوەی هەیە:

(ژێ) (ب ب ب ب ب ب)

ئەگەر وەکو دێڕە شیعرێک تەماشای نموونەکە بکەین، دەبینین لە نیو دێڕە شیعری (٦) بڕگەیی پێکهاتووە. لەو ڕوانگەیەشەوە، نموونە (ژێ) بەوێنەی شیعرێکی (ژاپۆنی) دادەنێین. بۆ دەستنیشانکردنی ئاستەکانی کێش و ڕیتم لە شیعرەکەدا، پێویستە (یەکە)کانی ئەو دوو ئاستە جیاکەینەوە.

لە باسەکانی پێشوودا ڕوومانمان کردەوە (یەکە)ی کێش لە هەموو شیعرێکدا بڕگەیە. کەواتە کێشی شیعرەکە لە نموونە (ژێ)دا (٦) بڕگەییە، بەڵام دیاریکردنی ڕیتمی شیعرەکە پێویستیی بەزانیارییەکی

عەوازەیە. بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ لە سروشتی بڕگەکانی ئەو زمانەی شیعرەکەی پێ وتراوە، ئاگاداربین.

لە زمانێکی وەکو زمانی (ژاپۆنی)دا، کە «بڕگەکانی کورت و کراوەن»[١٣]

نابێ چاوەڕێی شیعرێکی ڕیتمی بکەین؛ چونکە سروشتی هاوسەنگی بڕگەکانی، ڕێگا بەهیچ جۆرە گۆڕانکارییەکی (چەندی) نادات. ئایا ئەمە بەو واتایە زمانی (ژاپۆنی) ئەدگارێکی تایبەتیی نییە؟

لەم پارچە شیعرەی خوارەوەدا، کە نموونەیەکە لە بەناوبانگترین شیعری (هایکۆ)ی ژاپۆنی، (جی. ئێس. فرەیزەر) لەگەڵ شیکردنەوەی شیعرەکەدا وەڵامێک بۆ پرسیارەکەی پێشوو دەستەبەر دەکات:

| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| «فو | رو | ی | کی | یا | | |
| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ |
| کا | وا | زو | تو | بی | کو | مو |
| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | | |
| می | زو | نو | ئو | تو»[١٤] | | |

(فرەیزەر) دووجار هەوڵی داوە شیعرەکە بەجۆرێک وەرگێڕێتە سەر زمانی ئینگلیزی، ئەدگارە ژاپۆنییەکەی بپارێزێت. لە هەوڵی یەکەمدا، کە وەرگێڕانێکی وشە بەوشەی شیعرەکەیە، شێوەکانی سترێسی ئینگلیزی بەسەر دەقەکەدا زاڵ بووە. لە هەوڵی دووەمیشدا، هەرچەند ویستوویەتی لە ڕێگای کەمکردنەوەی بڕگەکانەوە لە (جووڵەی سووکی) شیعرەکە نزیک بێتەوە، دیسان ئەو ئەدگارەی زمانی ئینگلیزی خۆی بەسەر دەقە وەرگێڕاوەکەدا سەپاندووە. بەو شێوەیە، (فرەیزەر) ئاڵای سپی هەڵدەکا و بڕیار دەدات کێشی بڕگەیی ڕووتەڵ، لەگەڵ سروشتی زمانی ئینگلیزیدا ناگونجێت[١٥].

ئەو ئەدگارەی زمانی ژاپۆنی، کە ڕێگا لەو جۆرە هەوڵانە دەگرێت،



بەئەندازەی یەکەم سروشتی کورتی ڤاوڵەکانە. بەڵام ئەمە بەو واتایە نییە زمانی ژاپۆنی ئەدگاری دیکەی نییە، بەڵکو ئەوە دەگەیەنێت شیعری ژاپۆنی- لەبەر ئەوەی ئەو ئەدگارانە لە زمانی ڕۆژانەشدا بەکاردێن- ناتوانێت وەکو ڕەگەزێکی ستاتیکی سوودیان لێ وەرگرێت[١٦].

بەو ئەنجامە دەگەین (یەکە)ی کێش و (یەکە)ی ڕیتم لە شیعری ژاپۆنییدا هەر بڕگەی سەربەخۆیە، بەڵام لەبەر ئەوەی یەکەکانی ڕیتم- بەهۆی هاوسەنگیی یەکەکانی کێشەوە- جیاوازییان لە نێواندا نییە، ئەوا شیعری ژاپۆنی شیعرێکی کێشراوی کز ڕیتمە.

٢-٢-٢: بۆ بەراوردکردنی کێشی خۆماڵی لەگەڵ کێشی بڕگەیی ژاپۆنییدا، دەتوانین هەمان ڕێبازی (فرەیزەر)، لەگەڵ نموونە (هایکۆ) ژاپۆنییەکەدا بەزمانی کوردی دووبارە بکەینەوە، بەڵام هەوڵێکی وا - لەبەر چەند هۆیەک کە پاشان ڕوون دەبنەوە- ئەنجامێکی لەوەی ئەو چاکتری نابێت، کەواتە با نموونەی خۆماڵی بەکار بێنین.

ئەم دێڕەی خوارەوە، نموونەیەکە لە شیعرێکی (٨) بڕگەیی فۆلکلۆری، بڕگەکانیشی ئاوا دابەش دەکرێن[١٧]:

| | ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | نە | مەجـ | نوو | نم | نە | فەر | ها | دم |
| (ڤێ) | ڤ- | ڤ- | ڤ+ | ڤ- | ڤ- | ڤ- | ڤ+ | ڤ- |
| | زەحـ | مەت | کێـ | ش و | ڕەنج | بە | با | دم |
| | ڤ- | ڤ- | ڤ+ | ڤ- | ڤ- | ڤ- | ڤ+ | ڤ- |

چەندێتیی ڤاوڵەکان، وێنەیەکی نزیکمان لە سروشتی ڤاوڵەکانی شیعری ژاپۆنی پیشان دەدات. ڕەنگە نموونەیەکی وا، بۆ بەرگریکردن لە پۆلینکردنی شیعری فۆلکلۆری و کوردی وەکو شیعرێکی ڕووتی بڕگەیی، سەنگەرێکی لەبار بێت، بەڵام لە فۆلکلۆردا نموونەی جیاوازیشمان زۆرە.

(فێ١)

| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ما | لّی | وێـ | ران | کر | دم | چا | وی |
| ڤ+ | ڤ+ | ڤ+ | ڤ+ | ڤ− | ڤ− | ڤ+ | ڤ+ |
| دێ | وا | نەم | بۆ | زولّ | فی | خا | وی |
| ڤ+ | ڤ+ | ڤ− | ڤ+ | ڤ− | ڤ− | ڤ+ | ڤ+ |

دەتوانین زنجیرەیەکی درێژ لەم تاقیکردنەوانە ئەنجام بدەین، بەڵام لەوە ناچێت لەم ڕێگایەوە بەدۆخێکی ژاپۆنی بگەین. دوا هەل بۆ شیانی بڕگەی کوردی وەکو یەکەی سەربەخۆی ڕیتم، تاقیکردنەوەی چەندێتیی ڤاوڵەکان لەناو بڕگەکاندایە.

٢-٢-٣: ئەم دابەشکردنە بڕگەییەی خوارەوە، بۆ دێڕە شیعرێکی فۆلکلۆری کراوە، کە (شێخ نووری) وەکو نموونە بۆ پێناسەکردنی کێشی بڕگەیی هەڵی بژاردبوو:

(فێ نوون)

| ١ | ٢ | ٣ | ٤ | ٥ | ٦ | ٧ | ٨ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| کەس | نا | زا | نێ | بۆ | بێ | ڕەنـ | گم |
| کڤ−ک | ک ڤ+ | ک ڤ+ | ک ڤ+ | ک ڤ+ | ک ڤ+ | کڤ−ک | کڤ−ک |
| گیـ | ڕۆ | دەی | دەسـ | تی | فە | ڕەنـ | گم |
| ک ڤ+ | ک ڤ+ | کڤ−ک | کڤ−ک | ک ڤ− | ک ڤ− | کڤ−ک | کڤ−ک |

وەکو لە نموونەکەدا دەبینین، ڕێژەیەکی جیاواز لەنێوان چەندێتیی بڕگەکان و ڤاوڵەکاندا هەیە. بۆ دەستنیشانکردنی چەندێتیی ڕاستەقینەی ڤاوڵەکان، دەبێ دوو هۆکار ڕەچاو بکرێن:

(ئەلف) گڕی و کپیی کۆنسنانتەکان لە بڕگەکاندا.

(بێ) سروشتی بنەچەیی کورتی و درێژیی ڤاوڵەکان بەگوێرەی جێگای درکاندنیان.



هەرچەند تا ئێستا دەستوورێکی جێگیرمان لە بواری ئەو دوو خاڵەی سەرەوەدا نییە -لە ڕاستیشدا لە زۆربەی بوارەکانی دەنگسازیی کوردیدا وایە- بەڵام دەتوانین بەدەستکارییەکی کەمەوە، دوو دەستوورەکەی (غازی فاتیح وەیس)، کە لە ئەنجامی تاقیکردنەوەیەکی لابرەتۆریدا بۆ هەردوو ڤاوڵی (ی درێژ، ی کورت- بزرۆکە)ی کردووە[١٨] بۆ مەبەستەکانمان بەم شێوەیەی خوارەوە بەکاربێنین:

(فێ میم) ڤاولّ لەنێوان دوو کۆنسنانتی کپدا، کورت دەبێتەوە.

لەم خشتەیەی خوارەوەدا، ڤاوڵە کورتەکانی بڕگەکانی هەردوو نیوە دێڕەکە بەگوێرەی کڕی و کپیی کۆنسنانتەکانیان دابەشکراون:

| ز | بڕگەکان | کۆنسنانت | | ڤاوڵە کورتەکان | کۆنسنانت | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | کپ | گڕ | | کپ | گڕ |
| ١ | کەس | ک | | ە | س | |
| ٢ | ڕەن | | ر | ە | | ن |
| ٣ | گم | | ک | بزرۆکە | | م |
| ٤ | دەی | | د | ە | | ی |
| ٥ | دەس | | د | ە | س | |
| ٦ | تی | تـ | | ی | | |
| ٧ | فە | فـ | | ە | | |
| ٨ | ڕەنـ | | ر | ە | | ن |
| ٩ | گم | | ک | بزرۆکە | | م |

خشتەی (٢-١) ڤاوڵە کورتەکان لەگەڵ کۆنسنانتە گڕو کپەکاندا.

ئەگەر سەرنجی خشتەکەی سەرەوە بدەین، دەبینین ڤاوڵی ژمارە (١) کەوتۆتە نێوان دوو کۆنسنانتی کپەوە، واتە کورتتر بۆتەوە. ئەم دیاردەیە ڤاوڵی ژمارە (٥)یشی گرتۆتەوە، هەرچەندە کۆنسنانتەکەی پێشی گڕە، بەڵام بەزۆری دەنگی دواوە کار لە دەنگی پێش خۆی دەکات. ڤاوڵەکانی

ژمـــارە (٢ ، ٣ ، ٨ ، ٩) ش، هەرچەند بەهۆی نێـــوان کـــەوتنی دوو کـۆنسنانتی گـڕەوە، دەبوو چەندێتـیی خـۆیان بپـارێزن، بەڵام لێـرەدا بەر یەکێک لەو دەسـتـوورە گـشـتـییـانە دەکـەون کە (ئی. ئەی. مـایەر) لە ئەنجامی تاقیکردنەوەی کۆمـەڵێـک لە زمانانی جیـهان سەلماندوویەتی: «لام و کۆنسـنانتە لووتیـیـەکان ڤاوڵ کـورت دەکـەنەوە»[19]. بەو جۆرە، تەنیا بڕگەکانی ژمارە (٤ ، ٦ ، ٧) بەچەندێتیی خۆیان دەمێننەوە.

ئێـسـتا خـشـتـەیەکی وەکـو ئەوەی (٢-١) بۆڤـاوڵە درێژەکـان دروست دەکەین:

| ز | بڕگەکان | کۆنسنانت | | ڤاوڵە درێژەکان | کۆنسنانت | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | | کپ | گڕ | | کپ | گڕ |
| ١ | نا | | نا | ا | | |
| ٢ | زا | | زا | ا | | |
| ٣ | نێ | | نـ | ێ | | |
| ٤ | بۆ | | بـ | ۆ | | |
| ٥ | بێ | | بـ | ێ | | |
| ٦ | گیـ | | گ | ی | | |
| ٧ | ڕۆ | | ر | ۆ | | |

خشتەی (٢-٢) ڤاوڵە درێژەکان لەگەڵ کۆنسنانتە گڕ و کپەکاندا

سەرنجێکی خێرا لە خشتـەی (٢-٢)، پاراستنی چەندێتیی ڤاوڵەکان دووپات دەکاتەوە، بەتایبەتی لە بڕگەی کراوەشدان. بەڵام ئەو چەندێتییە لە هەموو ڤاوڵەکاندا چوونیەک نییە. لێرەدا هۆکاری (بێ) کاردەکات.

بە گـوێرەی دەسـتـوورێکی (مـایەر)، ڤـاوڵەکـانی پشـتــەوە بەزۆری هەندێک لە ڤاوڵە بەرامبەرەکانی پێشەوە کورتترن[20].

بە گـوێرەی ئەو دەسـتـوورە، ڤـاوڵـی (و) کـە جـێگای نێـوەڕاست و



پشـتـەوەی زمـانە و بڕگـەکـانی ژمـارە (٤ ، ٧)ی پێکهێناوە، لە ڤـاوڵی (ی) کە جێگای نێوەڕاست و پێشەوەی زمانە و بڕگەکـانی ژمارە (٣ ، ٥)ی دروستکردوون، کورتترە.

سەبارەت بەبڕگەکانی (١ ، ٢ ، ٦)یش، دیسان بەگوێرەی دەستوورێکی دیکەی (مایەر): ڤاوڵی (ی) داخراو لە ڤاوڵی (ی) کراوە و ئەمیش لە ڤاوڵی (١) کورتترە[21]، ڤاوڵی بڕگەی ژمارە (٦) لەگەڵ ڤاوڵەکانی (٤ ، ٧) ریزدەبێت. لە هەمـان کـاتدا ڤـاوڵەکـانی (٣ ، ٥) لە بەرامـبـەر ڤاوڵی (١)دا. کە بڕگەکانی (١ ، ٢)ی پێکهێناوە، کورتترن. کەوابێت تەنیـا ئەم دوو فاوڵەی دوایی چەندێتیی خۆیان پاراسـتووە. بەو جۆرە، ئەو جیـاوازیـیـانەی لە نموونە (فێ نوون)دا ڕووکـەشی بەرچاو دەکـەوتن، ئەزموون قووڵتریان دەکاتەوە.

هەوڵێـکی سـادە و سـەرپێـیی وەکـو ئەوەی لێـرەدا تـاقـیـمـان کـردەوە، ئەنجامێکی تیۆری و پراکتیکیی گرنگی هەیە. لە تیۆریدا، دەیسەلمێنێت کـورتی و درێژیی ڤـاوڵی لە زمـانی کوردیدا ڕاسـتـیـیـەکی فـۆنۆلۆژییـە و گەلێ جار ئەرکی ڕێزمانی دەگێڕێت[22].

لە پراکتیکیشدا، ئەوە دەگەیەنێت شیعری فۆلکلۆری - لەبەر ئەوەی (یەکە) کانی کێشی هاوسەنگ نین- دەبێ شیعرێکی ڕیتمی بێت.

ئەم دەرەنجـامـەش پرسـیـار لە بارەی ڕیتم و (یەکە)ی ڕیتـمی شیـعـرەکە دەورووژێنێت. وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە پێویستیی بەدەستنیشانکردنی یەکەی گەورەتر لە بڕگە هەیە، لە دۆخێکی واشدا یەکسەر (وشە) بەبیردا دێت.

بەڵام وشە، وەکو (مـالبـۆرگ) دووپاتی دەکاتەوە، یەکەی دەنـگ نییە، بەڵکو یـەکەی زمـانییـە، «لە ڕاسـتـیـشـدا، ئەو یـەکە باڵایەی ئێـمـە لێی دەگـەڕێین دەسـتـە دەنگـیـیـەکـانن»[23]. ئەمـەش بەرەو جـۆرێکی دیکەی شیعری بڕگەیی دەمانبات ئەو دەستە دەنگییانەی تێدا ڕێکخرابێت.

٢-٣ کێشی خۆماڵی و کێشی بڕگەی (فەرەنسی):

پێشتر وتمان (گۆران) لە ڕوانگەی تەکنیکی شیعری (فەرەنسی)یەوە دێڕە شیعرەکەی (مەولەوی)ی شیکردۆتەوە.

لە ڕاستیدا سەرچاوەی یەکەمی زانیارییەکانی لەم بارەیەوە، کتێبە ناسراوەکەی (مەندوور- فی المیزان الجدید)ە، کە چاپی یەکەمی لە ساڵی (١٩٤٤)دا بڵاوکراوەتەوە؛ چونکە زۆربەی ئەو زانیارییانەی لە موحازەرەکانی کۆلیجی ئەدەبیاتی بەغدادا لە بارەی شیعری فەرەنسییەوە بەقوتابییەکانی وتۆتەوە، لەو کتێبەدا دەبینرێن.

دووپاتکردنەوەی ئەو خاڵە لێرەدا، سەرەڕای ئەوە ڕێگا بۆ بەراوردکردنی هەردوو شیعرەکە دەکاتەوە، ئاماژە کردنە بۆ تێگەیشتنە تایبەتییەی کە (گۆران) لە هەندێ لە زاراوەکانی (مەندوور) پێکی هێناوە و لە ئەنجامدا زیانێکی گەورەی بەکرۆکی شیکردنەوەکەی گەیاندووە.

لە جێگای خۆیدا باسی ئەو خاڵە دەکەین، لە سەرەتادا با ئاورێک لە شیعری (فەرەنسی) بدەینەوە.

٢- ٣-١: لە زۆربەی باس و لێکۆڵینەوەکاندا، کاتێ ناوی کێشی بڕگەیی دێت، یەکسەر ئاماژە بۆ شیعری (فەرەنسی) دەکرێت، لە ڕاستیشدا ئەو پۆلینکردنە زمانی (فەرەنسی) خۆی، بەتوندی پشتگیریی دەکات.

لە بەرگی یەکەمی کتێبی (تیۆریی ژانرە ئەدەبییەکان)دا، کە گەورەترین سەرچاوەیە لە بارەی شیعری فەرەنسییەوە، (ڤینسنت) بەبەراوردکردنی شیعری (فەرەنسی) لەگەڵ شیعری (گریکی) و (لاتینیدا)، دەیەوێ ئەوە دووپات بکاتەوە شیعری (فەرەنسی) ئەو دوو ئەدگارەی شیعری (گریکی) و (لاتینی): (چەندێتیی بڕگەکان و سترێسی ئاوازەیی)، بەکار ناهێنێت.



ئەمەش بەلای ئەوەوە بۆ ئەو هۆیە دەگەڕێتەوە زمانی (فەرەنسی) لە ڕێڕەوی جیابوونەوە لە (لاتینی) و گەشەکردنی سەربەخۆیدا، ئەو دوو ئەدگارەی زمانی (لاتینی) لە دەست داوە. کاتێکیش شیعری (فەرەنسی) پەیدا بوو، ئەو دوو ئەدگارە هیچیان لە ئارادا نەمابوون[٢٤].

لە دوخێکی وادا، شیعری (فەرەنسی) ناچار بوو سوود لە دوو دیاردەی دیکە وەرگرێت:

(یەک) ژمارەی بڕگە.

(دوو) قافیە.

سیستێمی ژمارەی بڕگە، مەرجی یەکەمی لەوەدایە بڕگەکان لە چەند کۆمەڵەیەکدا کۆ بکرێنەوە و ژمارەیان لەو کۆمەڵانەدا چوونیەک بێت.

شیعری فەرەنسی، وەکو (سۆزان بێرنار) دەڵێت، بەهۆی ئاوێتە بوونی لەگەڵ گۆرانیدا، دوو (وەستان)ی تێدابوو: یەکێکیان لە کۆتایی نیوە دێڕی یەکەمدا و ئەوی دیبیان لە (قافیە)دا[٢٥].

لێرەدا گرنگیی قافیە بۆ شیعری فەرەنسی بەتەواوی دەردەکەوێت، بێ ئەو قافیەیە و وەستانەی کۆتایی نیوە دێڕی یەکەم کە هەمان ڕۆڵی قافیە دەگێڕێت، شیعری فەرەنسی تەنانەت بەلای دوژمنێکی سەرسەختی قافیەی وەکو (فینلۆن)یشەوە، بەتەواوی لە نێو دەچێت[٢٦].

کەواتە شیعری دێرینی فەرەنسی، لە دوو ڕێگاوە کێش و ڕیتمی خۆی دابین دەکرد: بۆ پاراستنی کێشەکەی، پشتی بەهەمان ژمارەی بڕگە لە هەردوو نیوە دێڕدا دەبەست. بۆ جیاکردنەوەی ئەو نیوە دێڕانەش لە پەخشانی ئاسایی و بەخشینی جۆرە ڕیتمێک، پشتی بەقافیە دەبەست.

قافیە لێرەدا تەنیا دیاردەیەکی ستاتیکی نییە، بەڵکو گرنگیی لەوەدایە هەمیشە سترێسێکی بەهێزی دەکەوێتە سەر، ئەمەش پیشانی دەدات لە زمانێکی وەکو ئینگلیزیدا دەیگێڕێت، بەڵام وشە فەرەنسییەکان، یان ڕاستتر کۆمەڵە دەنگییەکان لە فەرەنسیدا، هەمیشە

ستریسێکی بەهێز لە کۆتاییاندا وەردەگرن کە شیعری فەرەنسی بەچنگ و بەدان دەیپاریزێت.

گـرنگیی ئەو سـتـریسـە بەهێـزەی کـۆتایی نیـوە دێرەکـان پاشـتـر دەردەکەوێت، کاتێ ڕۆمانتیکییەکان دەست بەکەرت کردنێکی دیکەی نیـوە دێرەکـان دەکـەن. بەگـوێرەی ئەو دابەشکردنە تازەیە، هەر کـۆمـەڵە دەنگییەک بەستریسێکی بەهێز دوایی پێ بێت، بەهەنگاوێکی شیعری دادەنرێت. بەو شێوەیە، نیوە دێرەکان بەهۆی ستریسێکی بەهێز لەسەر چەند برگـەیەکی ناوخـۆیی، دەبن بەدوو کـەرتی تازەوە. لە شـیـعـرێکی (١٠) برگـەییدا- بەنموونە- ئەو ستریسە بەزۆری دەکەوێتە سەر برگەی چوارەمین، هەندێ جـاریش برگـەی پێنجـەمین. لە شـیـعـری (١٢) برگەییشدا، برگەی شەشەمین بەو ستریسە بەهێزە دوایی دێت[٢٧].

ئەوەی بەکورتی باسکرا، ئەو بنچینە فۆنۆلۆژی و ڕیتمییانە بوون کە شیعری فەرەنسییان لەسەر بنیات نراوە. ئێستا دەتوانین نموونەیەکی تیۆری بۆ سیستێمی شیعری فەرەنسی دارێژین، بۆ ئەوەی لەگەڵ نموونە کوردییەکەشدا ڕێک کەوێت، نەخشەی شیعرێکی (١٠) برگـەیی دەکێشین کە وەستان لە ناوەڕاستیدایە:

(فێ سین) (ب ب ب ب بَ) (ب ب ب ب ب بَ) / / (ب ب ب ب بَ) (ب ب ب بَ)

٢-٣-٢: بەگـوێرەی شیکردنەوەی دێرە شیعرەکەی (مەولەوی)، کە (گۆران) کردوویەتی، دەتوانین ئەم نموونە تیۆرییەی خوارەوە دارێژین:

(چۆن دێوانەی شـۆر) (ئازیزنە سـەردا)// (شـەتاوسـەر هۆرگـرت) (وەدەشت ودەردا)

(گـاف مـیم) (ب ب ب ب̽) (ب ب ب ب̽ ب̽)//(ب ب ب ب ب̽) (ب ب ب̽ ب̽)



سەرنجێکی سەرپێیی لە هەردوو نموونە تیۆرییەکە، ئەوە دەگەیەنێت زۆر لە یەکـتـر دەچن، بەڵام لە ڕاسـتـیـدا- بەگـوێرەی شـیـکردنەوەکـانی (ڤینسنت) لە بارەی شیعری فەرەنسییەوە و لێکدانەوەکەی (گۆران) لە بارەی شیعرەکەی (مەولەوی)یەوە، دوو جیاوازی لەنێوان نموونەکاندا هەن کەدەتوانین لەم دوو خاڵەی خوارەوەدا دەستنیشانیان بکەین:

(ئەلف) برگـەی پێنجـەمی هەر یەک لە هەنگاوەکـانی (فێ سین) نیشانەی ستریسی بەهێزیان بەسەرەوەیە، بەڵام لە نموونە (گاف میم)دا نیشانەی (×) بەرچاو دەکەوێت، ئەمەش لەبەر ئەوەیە (گۆران) ئاماژە بۆ قورساییەک دەکات لە کۆتایی هەنگاوەکاندا و زاراوەی (لەنگەر)ی بۆ بەکارهێناوە، دووپاتیشی دەکاتەوە ئەوە «لەنگەری هەڵبەستی پێ ئەڵێن و جیاوازە لەمەی سەر برگەی وشە»[٢٨]. ئەمەش بۆ تێگەیشتنی تایبـەتیی (گـۆران) لە زاراوەی (الارتکاز)، کـە (مـەندوور) بەکاریهێناوە، دەگەڕێتەوە.

گومانی تێدا نییە (مەندوور) ئەو زاراوەیەی بۆ (ستریس- النبر) بەکارهێناوە، بەو بەڵگەیەی لە باسی جۆرەکانی شیعری ئەوروپاییدا، بۆ شیعری (چۆنی - النبری) هەر زاراوەی (ارتکازی) بەکاردەهێنێت[٢٩]. بەڵام دووپاتکردنەوەکەی (مەندوور) لەوەی برگەکانی شیعری فەرەنسی بەستریس و کورتی و درێژی لە یەکتر جیا نابنەوە، بۆ مەبەستێکی بەراوردکاریی ڕووتە لەنێوان شیعری لاتینی، کە برگە کورت و درێژەکان ڕیتمەکەیان دروست دەکرد و شیعری ئینگلیزی، کە برگە بەهێز و بێ هێزەکان بەکۆمەڵ ڕیتمەکەی پێک دەهێنن، ئەگینا هەر خۆی کە دێرە شیعرێکی (ڕاسین) شی دەکاتەوە، بەئاشکرا ئاماژە بۆ برگە بەهێزەکانی کۆتایی هەنگاوەکان دەکات و نیشانەی ستریسی بەهیزیشیان (/) بۆ دادەنێت[٣٠].

(بێ) ئەگەر سەرنجی نموونە (گاف میم) بدەینەوە، دەبینین کۆمەڵەی دووەم لە هەر بەشێکی نموونەکەدا، نیشانەیەکی (×) وا بەسەر

دووکەرتی دوایەوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی (گۆران) لە نگەرەکەی خستۆتە سەر هەردوو وشەی (سەردا، دەردا)، کە هەر یەکەیان لە دوو بڕگە پێکهاتووە.

ئێستا دەمانەوێ بزانین شیکردنەوەی وشە (قورسەکان) چ جیاوازییەک لەنێوان (لەنگەر) و (سترێس)دا دەردەخات.

وشەکانی (شۆڕ، گرت) هەردووکیان یەک بڕگەیین، لەبەر ڕووناکیی لێکدانەوەکانی پێشووشدا، دەتوانین بڵێین (لەنگەر) لێرەدا بەتەواوی هاو ئەرکێ سترێسە. بەو جۆرە سترێس جێگای خۆی لەسەر ڤاوڵەکانیان دەکاتەوە.

وشەکانی (سەردا، دەردا) هەردووکیان لە ژمارە و جۆر و پێکهاتنی بڕگەدا چوونیەکن، لە ڕووی مۆرفلۆژیشەوە هەردووکیان لە ناوێک (سەر، دەر) و پاشگرێک (دا) پێکهاتوون. دەستنیشانکردنی سترێس بۆ هەر یەکێک لەو دوو وشەیە هەندێ ناکۆکیی تێدایە، لێرەدا دەبێ دوو جۆری سترێس بەراورد بکەین: سترێسی زمان و سترێس شیعر.

ئەگەر وەکو وشەی سەربەخۆ (سەردا، دەردا) سترێسبەندی بکەین، ئەوا سترێسی بەهێز وشەکانی (سەَر، دەَر) وەری دەگرن؛ چونکە پاشگر لە زمانی کوردیدا سترێسی بەهێز هەڵناگرێت[٣١].

بەڵام لە شیعردا، ئەو دەستوورەی سەرەوە هەموو کاتێک چالاک نییە، بەتایبەتی ئەگەر مەسەلە پێوەندی بەقافیەوە هەبێت. قافیە لەبەر ئەوەی دوایی بەڕستە مۆسیقاییەکان دەهێنێت، لە زۆربەی شیعری کێشراوی جیهاندا بەزرمەیەکی بەهێز کۆتایی دێت. کەواتە لە شیعرەکەدا، سترێسەکان دەکەونە سەر پاشگری وشەکانی (سەرداَ، دەرداَ)وە.

بەو شێوەیە، دەگەینە پلەیەک، نموونە (گاف میم) سەر لە نوێ بەم شێوەیەی خوارەوە دارێژینەوە:

(گاف میم ١) (ب ب ب بَ) (ب ب ب ب بَ) // (ب ب ب بَ) (ب ب ب بَ)



ئەمە ئەو وێنەیەیە (گۆران) ویستبووی سیستێمی ڕیتمیی کێشی خۆماڵی لە شێوەی بکێشێت. وێنەیەکی وا، بەو ڕوونییەی نموونە (گاف میم ١) پیشانی دەدات، لە هەمان کاتیشدا پشت بەئەدگارێکی گرنگی زمانی کوردی دەبەستێت: (سترێس)، دەیتوانی کێشی خۆماڵی- ڕەنگە شیعری نوێی کوردیش- بەقۆناغێکی ڕەخنەیی و ستاتیکیی گەشتر ئاشنا بکات.

هەر چۆنێک بێت، بەراوردکردنی کێشی خۆماڵی لەگەڵ کێشی بڕگەیی فەرەنسیدا، دەستکەوتێکی (تەکتیکی)ی ڕاستەوخۆی بۆ کێشی خۆماڵی هەبوو کە لە نموونە (گاف میم ١)دا دەردەکەوێت.

ئەو بەراوردکردنە سەلماندی هەر کۆمەڵەیەکی ڕیتمی لە شیعرەکەدا نیشانەیەکی دەنگیی پێوەیە، ئەو نیشانە دەنگییەش بریتییە لە سترێسێکی بەهێز لەسەر یەکێک لە بڕگەکانی کۆمەڵەکە. بەڵام ئەو ئەدگارە هاوبەشە لەنێوان کۆمەڵە دەنگییەکانی کێشی خۆماڵی و فەرەنسیدا، ئەوە نابەخشێت بنیاتی لەو دوو کێشەدا یەک سیستێمی هەیە.

ساغکردنەوەی ئەو تێبینییە پێویست دەکات سەرنجێک ئاراستەی پێکهاتنی بڕگەیی کۆمەڵە دەنگییەکانی هەردوو کێشەکە بکەین: (هەنگاوەکان).

سەبارەت بەشیعری فەرەنسی، کۆمەڵە هاو ژمارەکان بێ گومان هاوکێشن.

لە هەندێ دۆخیشدا کە هەنگاوەکان لە بڕگەیەکدا جیاوازییان دەبێت، لە نموونەی یەکێک لە وێنەکانی شیعری (١٠) بڕگەیی: (٤+٦)، ئەوا زانایەکی وەکو (گرامۆن) داوا دەکات لە خوێندنەوەدا ئەو جیاوازییە چارەسەر بکرێت[٣٢].

لە شیعری فۆلکلۆریی کوردیدا، کێشە باوەکانی (٧، ٨، ١٠)

برگەیی، بەشێوەیەکی ئاسایی بەسەر ئەم کۆمەڵە دەنگییانەی خوارەوەدا دابەشکراون:

- شیعری (٧) برگەیی= (٤+٣).
- شیعری (٨) برگەیی= (٤+٤).
- شیعری (١٠) برگەیی= (٥+٥)[٣٣].

هەرچەند لە سنووری دابەشکردنەکەی سەرەوەی (گۆران)دا، دەتوانین ئاماژە بۆ وێنەیەکی دیکەی شیعری (٧) برگەیی: (٣+٤) بکەین، بەڵام ئەوە هەموو وێنەکانی شیعری فۆلکلۆری نین. هەر (گۆران) خۆی لە بواری شیعری (٨) برگەییدا ئاماژە بۆ «جۆرە دەستکاری کراوەکانی» ئەو کێشە لەلایەن بوێژە تازەکانەوە دەکات[٣٤].

(دڵشاد عەلی)ش، شەش چەشنە پێی (هەنگاو)ی دەستنیشان کردووە: (١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦) برگەیی، کە دەشێت لە سنووری کێشێکدا بەکاربێن[٣٥].

لە شیعری فۆلکلۆریشدا- تەنیا شیعری (١٠) برگەیی لێ دەرچێت- دەتوانین گەلێ کۆمەڵە دەنگی وەکو (٣+٥، ٢+٥) و جۆری دیکە بدۆزینەوە، کە پێشنیازەکەی (گرامۆن) ناتوانێت هاوسەنگیان بکات.

دەستنیشانکردنی ئەو کۆمەڵە دەنگییانە و مەرجەکانیان کارێکی بەهێز دەکاتە سەر دیاریکردنی کێش و ڕیتمی شیعرەکان. ناهاوسەنگیی دەستە دەنگییەکانی شیعری فۆلکلۆری کوردی و شیعری (فەرەنسی)، جیاوازیی جۆر و ژمارەی مەڵبەندە ڕیتمییەکانی کێشەکانیان دەسەلمێنێت.

٢-٤ عەرووز و کێشی خۆماڵی:

لە نێوەندە کوردییەکاندا باوەڕێکی فراوان لە ئارادایە- ئەو باوەڕەش لەو تێڕوانینەوە سەرچاوە دەگرێت هەر شیعرێکی کوردی ئەگەر عەرووزی نەبوو برگەییە- کە بەراوردکردنی ئەو دوو کێشە هەوڵێکی سەربار و



ئەنجامەکەشی پێشەکی بڕاوەتەوە.

باوەڕێکی وا، هەرچەند تاکو ئێستا لەسەر بناغەیەکی بەراوردکاری بنیات نەنراوە، زۆر دروست نییە.

سەلماندنی ئەو باوەڕە، بەرامبەر بەکێشێک ماوەیەکی درێژ لە تەلاری شیعری کلاسیدا ئاوێنە بووە، زمانی کوردیش لە ڕێگای چەندێتیی جیاوازی برگەکانییەوە ئەو تێکەڵاوییەی بەهێزتر کردووە، کارێکی ئەوەندە سووک نییە، لە ڕاستیشدا لێرەدا بەهۆی سروشتی باسەکەوە، هەوڵێکی سەرەتایی بۆ تەرخان دەکرێت.

سیستێمی برگەیی چەند (تەفعیلە)یەکی وەکو (موفاعەلەتون، موتەفاعیلون، موستەفعیلاتون)، کە بناغەی کێشەکانی (وافیر، کامیل، ڕەجەزی مورەففەل) پێک دەهێنن و هەر یەکەیان لە (٥) برگە پێکهاتوون، (تەفعیلە)ی وەکو (مەفاعیلون، فاعیلاتون، موستەفعیلون)، کە کێشەکانی (هەزەج، ڕەمەل، ڕەجەز) دروست دەکەن و هەمووشیان (٤) برگەیین، لە شیعردا بەزەحمەت لە هەنگاوە هاوژمارەکانی دابەشکراوی ئێستای کێشی خۆماڵی جیا دەکرێنەوە؛ چونکە بەهۆی ئەو هاوسەنگییەوە، بنیاتی ڕیتمیشیان بەیەکدا دەچێت[٣٦].

ڕەنگە ئەو خاڵە، لایەنێکی باسەکەی (د. ئیحسان فوئاد) ڕوون بکاتەوە کاتێ ئاماژە بۆ دوو کێشی (هەزەج، ڕەمەل) دەکات کە بەلێهاتووییەوە وەڵامی مەبەستەکانی شیعری تازەی کوردی دەدەنەوە[٣٧].

(هەردی)یش لە وتارێکی درێژدا لە بارەی ئەو کێشانەی لە عەرووزی کوردیدا پتر بەکارهاتوون- هەرچەند بەلای ئەوەوە بڕیارێکی وا ئەگەر لەسەر شیکردنەوەیەکی وردی دیوانی شاعیرەکان نەبێت «لە بۆچوونێکی تێکڕایی، تێپەڕ ناکات»- لەگەڵ ئەوەشدا، ئاماژەی بۆ (٣) کێش و جۆرەکانیان لە شیعری کلاسیی کوردیدا کردووە: (ڕەمەل- جۆرێکی،

هەزەج – چوار جۆری، موزایع– جۆرێکی)، بۆچوونەکانی پێشوو دەسەلمێنن[٣٨].

بەڕاستی ئێرە جێگای بەسەرکردنەوەی هەموو ئەو باسانە نییە لەو بارەیەوە پێشکەش کراون، بەلام ئەژمارێکی وەکو ئەوەی (هەردی) باسی دەکات، زەمینەیەکی لەبار بۆ بەراوردکردنی کێشی خۆماڵی و عەرووزی خۆش دەکات[٣٩].

٢– ٤–١ (عەرووز) لەوە ناسراوترە لێرەدا هەوڵی پێناسە کردنی بدەین، هەر لە کتێبی (العقد الفريد)ی (ابن عبدربّە) ەوە، تا دوا چاپی کتێبی (فن التقطيع الشعري و القافية)ە کەی (د. صفاء خلوصي)، خەرمانێکی بەربلاوی باس و لێکۆڵینەوە و پێناسەکردنی ئەو سیستێمە شیعرییە نووسراوە و بلاوکراوەتەوە. کرۆکی زۆربەی ئەو کارانەش ئەوەیە «عەرووززانەکان خۆیان لەسەر سروشتی تیپە بزواو نەبزواوەکان و بەدوایەکدا هاتنیان بۆ پێکهێنانی ڕیتمێکی دیاریکراو، بنیات ناوە»[٤٠].

بەلام لە لێکۆڵینەوە تازەکاندا، بەتایبەتی کاتێ ڕۆژهەلاتناسەکان ئاوڕیان لە عەرووزدایەوە، وردە وردە زاراوەی (تیپی بزواو و نەبزواو) جێگای خۆی بۆ (بڕگەی کورت و درێژ) چۆڵ کرد.

ئەو زاراوە گۆڕینە، ئالۆزییەکانی عەرووزی بەئەندازەیەکی دیار کەم کردەوە، سەرەڕای ئەوەش پەردەی چەند سەد ساڵەی لەسەر لایەنی ڕیتمی شیعرەکە لادا، بەهۆی بایەخدان بەکێشی (تیپ)ەکانەوە پشتگوێ خرابوو.

دەتوانین کتێبە بەناوبانگەکەی (مەندوور)، کە لە کەرتی پێشوودا ئاماژەی بۆ کرا: (٢–٣)، بەسەرەتای ئەو هەولانە بژمێرین پاشتر نووسەرانی وەکو (عەیباد) و (نووەیهی) و (ئەبودیب) و چەندینی دیکە بۆ دەستنیشانکردنێکی وردتری بنیاتی مۆسیقایی کێشە عەرووزییەکان، پێشکەشیان کرد.



لە ڕاستیدا ئەو بەڕوونی سنوورەکانی کێش و ڕیتمی چەند نموونەیەکی عەرووزیی دیاریکردووە و هەندێ ئەنجامی تیۆری و پراکتیکیی لە باسەکان دەرکێشاوە، بایەخێکی تایبەتییان هەیە.

لە شیکردنەوەکانی ئەم کەرتەدا، ئەندازەی یەکەم بۆچوونەکانی ئەو لە بارەی عەرووزەوە ڕەچاو دەکەین، بەتایبەتی شیکردنەوەکانی (کامیل ژیر)یش، کە بۆ بەشی کوردیی بەراوردکردنەکە بەکاریان دەهێنین، کارتێکردنی ئاشکرای بۆچوونەکانی ئەویان پێوە دیارە.

٢– ٤–٢: هەولەکانی (مەندوور) ئاراستەی دوو لایەنی شیعری عەرەبی کراون: یەکەمیان سەلماندنی هاوکێشیی هەنگاوەکانە، تەنانەت کاتێ بەهۆی گۆڕانکارییەکانی (زیحاف) و (عیللە) شەوە چەندێتیان دەگۆڕێت، دووەمیشیان پیشاندانی بنیاتی ڕیتمیی شیعرەکەیە، کە بەڕای ئەو هاوکێشیی بڕگەکان بەتەنیا دابینی ناکات.

بۆ ساغکردنەوەی مەبەستی یەکەم، دێڕە شیعرێکی (امرؤ القيس) لە تاقیگەی فۆنێتیکی (پاریس) شی دەکاتەوە و لە ئەنجامدا بەژمارە و پێوانە دەیسەلمێنێت چەندێتیی هەنگاوە (زیحاف) پێکراوەکان، لە هەنگاوە (سالیم)ەکان کەمتر نییە، هۆی ئەو دیاردەیەش، بەڕای ئەو، بۆ پرۆسێسی ئاڵ و گۆڕکردنی دەنگەکانی شیعرەکە دەگەڕێتەوە کە لە خوێندنەوەدا بەشێوەیەکی سەربەخۆ ڕوودەدات. لە ئەنجامیشدا دەسەلمێت (زیحاف) و (عیللە)کان چەندێتیی هەنگاوەکان ناگۆڕن، لەبەر ئەوە کێشی شیعرەکە تێک ناچێت[٤١].

گرنگترین لایەنی تاقیکردنەوەکەی (مەندوور)، لە هەولدانیدا بۆ دەستنیشانکردنی سیستێمی ڕیتمی شیعرەکە دەردەکەوێت کە بەکێشی (الطويل) هۆنراوەتەوە و (تەفعیلە) کانی لە (٤) جار (فەعوولون مەفاعیيلون) پێکدێت.

ئەو، لەو بۆچوونەوەی لەبەر کارتێکردنی تیۆرییەکەی (ڤایل) پەرەی پێداوە: (١–٣–١)، پێی وایە بۆ ئەوەی هەست بەڕیتمی شیعرەکە

بکەین، دەبێ دیاردەیەکی دەنگی لە چەند جـــێگایەکی هاوکــــاتی هەنگاوەکـاندا دووبارە بێـتەوە، ئەو دیاردەیەش بەلای ئەوەوە سـترێسە: (الارتکاز الشعري- النبر).

دەستنیشـانکردنی جێگای سـترێسـەکان بەلای ئەوەوە، بڕگەی درێژی دووەمی هەر یەکێک لە هەنگاوەکـانە، بەڵام هەنگاوی (مەفـاعـیـیلون) لەبەر ئەوەی لە (فـەعـوولون) درێژترە، سـترێسـێکی ناوندیش: (ثانوی) دەکەوێتە سەر دوا بڕگەی[٤٢].

هەڵسەنگاندنی بۆچوونەکـانی پێشوو لە مـەبەستـەکـانی ئەم نامەیەدا نییە، هەرچەند پێویستە ئاماژە بۆ چەند خاڵێکیان بکرێت:

(یەک) جیاکـردنەوەی ڕوونی ئاستـەکـانی کێش و ڕیتمی شیـعـرەکە، کارێکی گرنگ و بەسوودە.

(دوو): دەســـــتـنیـــــشـــــانکردنی دیاردەیـەکی دەنـگی لـە هەر (تەفعیلە)یەکدا، یەکێکە لە پێویستییەکانی ڕیتمەکەی.

(سێ): بەڵام دانانی سـترێس بەو دیاردە دەنگییە لە شیـعـر و زمانی عـەرەبیـدا، زۆر لەگـەڵ سروشـتی زمـانەکـەدا ناگـونجێت. بەڵگەی ئەم بووچوونە، لەو دەسـتووره جیـاوازانەدا دەردەکـەوێت چەند نووسـەرێکی عــەرەب بۆ ســتــرێسی زمــانی عــەرەبیــان داناوە[٤٣]، تەنانەت لە و نموونەیەشدا (د. محمد علی الخولی) بۆ سەلماندنی فۆنیمایەتیی سترێس لە زمــانی عــەرەبیــدا هێناویەتــیــەوە: (ذهب- ذهبــا)، پتــر ئەدگــارە بنەچەییەکەی زمانەکە: (کورتی و درێژیی بڕگەکان) دەسەلمێنێت نەک ئەدگاری سترێسبوونی. ئەدگارێکی دەنگیش ئەگەر لە زمانێکدا نەبوو، یان هیچ نەبێ سەرەکی نەبوو، لە شـیـعـرەکـەشیـدا بنیـاتی ڕیتـمـەکـەی دروست ناکات.

ئاماژەکردن بۆ سترێس لە شیعری عەرەبیدا، لە سەرەتادا لەلایەن چەند ڕۆژهەڵاتناسـێکەوە ڕوویدا و پاشـان هەندێ لەو نـووسـەرە عــەرەبانەی ڕۆشنبـیـریـیـەکی ڕۆژئاواییـیـان هەبوو، ئەو بۆچوونەیان وەرگـرت و لە



شیکردنەوەکانیدا بەکاریان هێنا.

(ڤــایـل) یەکـــێک لەو ڕۆژهەڵاتناســـانە بوو ســـەرنجی (وەتەدی مـەجمـووع)ی لە هەنگاوەکـانی عـەرووزدا دا و بـۆی دەرکەوت لە هەمـوو کێشـەکـاندا ڕۆڵـی (ناوکی ڕیتمی) دەگێڕێت، لەمـەوە بڕیاری دا بڕگەی درێژی ئەو ناوکـــە: (بزواوی دووەم و نەبزواوی ســـێـــیـــەم بەزاراوە عەرووزییەکە) هەمیشە هەڵگری سترێسێکی بەهێزە[٤٤].

ئەگـەر سەرنجی سـترێسـبەندییەکـەی (مـەندوور) لە شـیـکردنەوەکـەی پێشوودا بدەین، دەبینین بڕگەی درێژی دووەمی هەردوو هەنگاوەکە:

(فــەعــوو- مــەفـــا)، لەو (وەتەد)ە پێکهـاتوون کــە ســتــرێســە سەرەکییەکانی لەسەر ڤاوڵە درێژەکانیان داناوە.

ئەو ئەنجامە گرنگە، لە هەمووبارێکدا دەیسەلمێنێت (وەتەدی کۆمەڵ) ناوکی ڕیـتـمـیـیـە، بەڵام لەبری سـتـرێس، درێژیی پـتـری بڕگـەی دووەمی (وەتەد)ە کـــە، ئەو دیاردە دەنگیــیـــە دروست دەکـــات (مـــەندوور) مەبەستێتی. ئەمەش بەڕای دەستـەیەکی فراوان لە نووسەرانەوە، لەگەڵ بنەچەی سروشـتی زمانی عەرەبیدا پتر ڕێک دەکەوێت[٤٥].

دەتوانین بۆچوونەکانی پێشوو لەم دوو خاڵەدا کۆبکەینەوە:

(مـیم عـەین ١): کـێـشی عـەرووز لە چەند هەنگاوێکی هاوسـەنگ پێکدێت.

(مـیم عـەین ٢): ڕیتـمـیش لە دووبارە بوونەوەی سـترێسـێک لەسـەر بڕگەیەکی درێژی دیاریکراوی هەنگاوەکان دروست دەبێت.

٢- ٤-٣: گرنگیی بۆچوونەکانی (ژیر)، بەئەندازەی یەکەم، لەو پرسیار و بابەتانەدایە لە بارەی کـێش و ڕیـتـمی خـۆمـاڵی و عـەرووزییـەوە لە دووتوێی وتارەکەیدا دەیانورووژێنێت. بەڵام بەداخەوە، لەو ئەرکەیدا، کە دەتوانین بەتازەترین هەوڵدان بۆ دەرچوون لە کـۆڵانی داخـراوی کـێـشی بڕگــەیی بیــژمــێـرین، بەهۆی کــەوتنە بەر کــارتێکردنی بۆچوونەکــانی

(مەندوور). مەبەستێکی تەواو پێچەوانەی پێکاوە.

دەتوانین بۆچوونەکانی (ژیر) لە دوو ئاستدا پۆلین بکەین، کە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر تێکەڵکراون:

(ئەلف) ئاستی کێش:

بەلای (ژیر)ەوە، هەموو هەڵبەستێکی عەرووزی بەتەرازووی پەنجەش دەکێشرێت، لەبەر ئەوە دەتوانرێت هەر دوو کێشەکە تێکەڵ بکرێت، بێ ئەوەی «مۆسیقای هەڵبەستەکە» بشێوێت، لێکدانەوەی ئەو دیاردەیە بەڕای (ژیر)، هاوکێشیی بڕگەکان لە هەنگاوەکاندا دابینی دەکات[٤٦].

لەسەرەتای ئەم فەسڵەدا، (یەکە)کانی کێش و ڕیتممان لە یەکتر جیاکردەوە و وتمان لە هەموو شیعری کێشراوی جیهاندا، بڕگە (یەکە)ی کێشە. کەواتە دەتوانرێت- نەک هەر شیعری عەرووزی- بەڵکو هەموو شیعرێک بڕگەکانی بەپەنجە بژمێررێت. وتیشمان جیا نەکردنەوەی (یەکە)کانی کێش لە (یەکە) کانی ڕیتم- کە لە ژمارەیەکی (یەکە)ی کێش پێکدێت- لە تیۆریدا دەبێتە هۆی تێکەڵکردنی ئاستەکان و لە پراکتیکیشدا سنووری نێوان سیستێمە جیاوازەکان دەسڕێتەوە. ئێستا دەبینین چۆن ئەو دوو ئەنجامە لە نموونە و شیکردنەوەکانی وتارەکەدا ڕەنگیان داوەتەوە.

ئێستا ئێمە لە سنووری کێشداین، واتە پێویستە چەندێتیی بڕگەکان لە هەنگاوەکاندا دەستنیشان بکەین، ئەمەش ناچارمان دەکات لە سروشتی بڕگەکان لە کۆمەڵە دەنگییەکاندا بکۆڵینەوە.

ئەو بەربەرەکانییەی دژ بەهاوسەنگیی بڕگە سەربەخۆکان لە کەرتی (٢-٢)دا کردمان، لێرەدا هیچ سەرکەوتنێک بەدەست ناهێنێت؛ چونکە بڕگەکان لە سنووری کۆمەڵەی دەنگیدا، دەربڕینە لەبارەکەی (د. خەزنەدار)، «تەفاعولێک لە بەینیانا ڕوو ئەدا» جیاوازیی کورتی و درێژییان بەگشتی چارەسەر دەکات.



کەواتە لێرەدا هەوڵی ئەوە نادەین جیاوازیی هەنگاوێکی (٤) بڕگەیی، بەنموونە، لەگەڵ (تەفعیلە)یەکی عەرووزی بەهەمان ژمارەی بڕگەوە، بسەلمێنین و، گومانی تێدا نییە لە ئاستی کێشدا جیاوازییەکی بنەڕەتییان لە نێواندا نییە، (مەندوور)یش ئەو پرۆسێسەی زانستیانە سەلماندووە کە بۆچوونەکانی (ژیر) لە وتارەکەدا نواندوویانە. بەو شێوەیە دەبینین، تێنەگەیشتنی (ژیر) لە بڕگە، وەکو (یەکە)ی ڕووتی کێش و، (هەنگاو) وەکو (یەکە)ی ڕیتم، بەرەو ئەو ئەنجامەی بردووە بڕیار بدات تێکەڵکردنی کێشی خۆماڵی و عەرووزی «مۆسیقای هەڵبەستەکە» تێک نادات. ئەمەش بەرەو خاڵی دووەمی بۆچوونەکان دەمانبات.

(بێ) ئاستی ڕیتم:

بۆ سەلماندنی بڕیاری تێک نەچوونی «مۆسیقای هەڵبەست» بەتێکەڵکردنی کێشی عەرووزی و خۆماڵی، (ژیر) دوو نموونە لە شیعری (گۆران) بەبەڵگە دەهێنێتەوە: یەکەمیان بەکێشی عەرووز و دووەمیان بەکێشی خۆماڵی داڕێژراون. لە بارەی نموونەی یەکەمەوە دووپاتی دەکاتەوە دەبێت لە بەرامبەر هەنگاوی (مەفاعیلون)دا - کێشی شیعرەکە (هەزەج)ی شەش هەنگاویی (مەحزووف)ە- دەبێ هەر (مەفاعیلون) و بەرامبەر (فەعوولون) هەر (فەعوولون) بێت. بەڵام لە شیعرە «پەنجە»ییەکەدا مەرج نییە هەنگاوەکان بەو جۆرە بن؛ چونکە نیوە دێڕەکان بەم شێوەیەی خوارەوە پێکهاتوون:

| ئەرۆیشتم | بەئەسپایی | کش و مات |
|---|---|---|
| مفاعیلن | مفاعیلن | فعلن[٤٧] |
| ب - - - | ب - - - | ب ب - |
| لاشە سست و | دڵ کەیلی تا | سەو ئاوات |
| فاعلاتو | مستفعلن | مفعولن |
| - ب - ب | - - ب - | - - - |

هۆی ئەوەش بەلای (ژیر)ەوە بۆ سروشتی زمانی کوردی دەگەڕێتەوە کە تەنیا ژمارەی بڕگە لە هەنگاوەکاندا بەسە بۆ ڕەوانیی هەڵبەستەکە، لە عەرەبیشدا هەر سروشتی زمانەکە پێویستیی بەو کێشە عەروزییە کردووە[٤٨].

ئێستا هەوڵ دەدەین ئەو دوو خاڵە شی کەینەوە، کە نموونەکە و لێکدانەوەکە دووپاتییان کردۆتەوە: ڕەوانیی دێڕە شیعرەکە و سیستێمی کۆمەڵە دەنگییەکان.

(یەک) ڕەوانیی دێڕە شیعرەکە: لەگەڵ ئەوەدا هەنگاوەکان هەمان سیستێمی ڕیزبوونی بڕگەییان نییە، بەڵام لە خوێندنەوەی دێڕە شیعرەکەدا هەست بەهیچ لەنگییەک ناکرێت، هۆی ئەمەش، نەک ژمارەی ڕووتی بڕگەکان لە هەنگاوەکاندا- وەکو (ژیر) بۆی چووە- پێکیهێناوە، بەڵکو بۆ سیستێمی ڕیتمیی کێشی خۆماڵی دەگەڕێتەوە کە بنیاتێکی جیاوازی لە سیستێمی عەروزی هەیە.

کەواتە بۆچی هەست بەلەنگیی دێڕە شیعرەکە ناکرێت؟

ئەو لێکدانەوەی (ژیر) لە بارەی بەپێزیی (مرونە) زمانی کوردی و توانای هاوسەنگکردنی بڕگە کورت و درێژەکانەوە پێشکەشی دەکات، تەنیا کێشی هەنگاوەکان دەگرێتەوە نەکو ڕیتمی شیعرەکە، هاوکێشیی هەنگاوەکانیش وەکو (مەندوور) سەلماندوویەتی بەتەنیا ڕیتمی شیعرەکە پیشان نادات، کەواتە هێشتا پرسیارەکە بەردەوامە: بۆچی هەست بەلەنگیی دێڕە شیعرەکە ناکرێت؟

بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکە، لە سەرەتادا بەبۆچوونێک دەست پێدەکەین زۆر باوەڕهێنەرە، مەبەستیشمان لە لێکدانەوە دەروونییەکەی (ڕیچاردز)ە. ئەگەر دەست بەخوێندنەوەی بارچە شیعرێکی عەروزی بکەین، با ئەو شیعرەش بێت (ژیر) لە دیوانەکەی (گۆران)دا هەڵیبژاردووە، هەر دوای دووسێ دێڕ خوێندنەوە، هەستمان لەگەڵ



جۆرێکی تایبەتی لە دووبارە بوونەوەی بڕگە کوردت و درێژەکاندا ڕادێت ئەمە وێنەکەیەتی:

(ب ---/ ب---/ ب--)

ئەو ڕاهاتنە وامان لێ دەکات تەنیا چاوەڕێی ئەو جۆرە دووبارە بوونەوەیە بکەین. ئەگەر لە پڕا زنجیرەی دووبارە کردنەوە کە گۆڕا: (- ب- ب، بەنموونە) ئەوا یەکسەر هەست بەتێکچوونی زنجیرەکە و ڕیتمی شیعرەکە دەکەین، هەرچەند هەنگاوە تازەکەش هەر لە (٤) بڕگە پێکهاتووە.

بەڵام لە کێشی خۆماڵیدا، کە زنجیرەیەکی دیاریکراوی دووبارەکردنەوەی بڕگە کورت و درێژەکان، خۆی بەسەر هەستدا ناسەپێنێت، گۆڕانی زنجیرەکەش هیچ هەستکردنێک بەلەنگی دروست ناکات.

دەتوانین ئەو دوو کردارە بەنموونەی فیلمێکی سینەمایی و ژمارەیەک (سلاید) لێک بچوێنین، لە فیلمە سینەماییەکەدا هەر لادانێک لە بابەتەکە، یەکسەر وریایی دەشێوێنێت، بەڵام لە تەماشاکردنی چەند (سلاید)ێکدا، هەرچەند بابەتەکان هەمەڕەنگ بن، هەستکردن بەتێکچوونی وریایی دروست نابێت؛ چونکە لەگەڵ هەر هەڵبوون و کوژانەوەیەکدا، هەست ئەو ماوەیەی دەبێت خۆی بۆ بابەتێکی جیاواز ئامادە بکات.

لەو ڕوانگەیەوە، دەتوانین سەرنجی تاقیکردنەوە شیعرییەکەی (ژیر) بدەین کە بریتییە لە پێنج خشتەکییەک لەسەر غەزەلە بەناوبانگەکەی (کوردی- ئەمان مردم)، کە لە (هاوکاری) ژمارە (٩٠٥)ی (١٩٨٧)دا بڵاوی کردۆتەوە.

بەپێچەوانەی بۆچوونەکەی (کاوە فیدا) وە، دێڕەکانی (ژیر) هەرچەند پێڕەویی تەواویان لە سیستێمی بڕگەیی هەنگاوە عەروزییەکانی شیعرەکەی (کوردی) نەکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا لە خوێندنەوەی پێنج

خشتەکییەکەدا، هەست بەو لەنگییە ناکرێت (کاوە) بەئاسمان و ڕێسمانی لێک چواندووە(٤٩). بەڵام هۆی ئەوە- وەکو (ژیر) بۆی چووە- پێوەندیی بەژمارەی ڕووتی بڕگەکانەوە نییە، بەڵکو بەئەندازەی یەکەم بۆ هەستکردنی خوێنەر دەگەڕێتەوە.

پێنج خشتەکییەکە بەسێ دێڕی ناعەرووزی دەست پێدەکات کە ماوەیەکی لەبارە بۆ ئەوەی هەستی خوێنەر بەپێکهاتنی دێڕەکان ڕابێنێت. کاتێ دوو دێڕەکەی (کوردی) دێنە پێشەوە، ئەو هەستکردنەی پێشوو بەسەر سیستێمی دوو دێڕەکەدا زاڵ دەبێت و هەمان جۆری خوێندنەوە بەسەریاندا دەسەپێنێت.

لەوە دەچێت ئەمە تاکە چارەسەرێک بێت بۆ لێکدانەوەی گونجانی دوو سیستێمی جیاواز، بەڵام سەرەکیترین کەموکوڕی لەو ڕێبازەدا ئەوەیە پشت بەخوێندنەوەی تاکە کەسی دەبەستێت و وا لە خوێنەر دەگەیەنێت جیاوازیی سیستێمەکانی کێش لە هەستپێکردنی ئێمەدایە نەک لە بنیاتی سیستێمەکان خۆیاندا. ئەمەش لە پراکتیکدا بەهەمان ئەنجامان دەگەیەنێت کە (ژیر) لە بارەی کێشی خۆماڵییەوە پێی گەیشتووە: «تەنیا ژمارەی بڕگە لە هەنگاوەکاندا بەسە بۆ ڕەوانیی هەڵبەست».

کەواتە، بۆ هەر بەراوردکردنێکی دروست لەنێوان دوو سیستێمی جیاوازی شیعریدا، پێویستە ئاستی خوێندنەوە و ئاستی بنیاتی ڕیتمی سیستێمەکان بەیەکەوە ڕەچاو بکرێن، سەرنجدانی یەکێکیان بێ ئەوەی دیکە، ئەنجامێکی وەکو ئەوەی (ژیر) و (کاوە)ی دەبێت.

(دوو) سیستێمی کۆمەڵە دەنگییەکان:

لە سیستێمێکی کێشیی وەکو عەرووزدا، کە هەنگاوەکان بەگوێرەی قاڵبێکی لەپێشدا داڕێژراو جیا دەکرێنەوە، دەستنیشانکردنی سنووری نێوان ئەو هەنگاوانە کارێکی گران نییە. بەڵام نەبوونی قاڵبێکی وا لە کێشی خۆماڵیدا، ڕێگا بەگەلێ وێنەی جیاوازی کۆمەڵەی دەنگی دەدات کە گەلێ جار لە چەمکی (هەنگاو) دەردەچن.



ئێمە لەسەر چ بنچینەیەک هەنگاوەکان جیا دەکەینەوە؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە، سەرنجی نموونەیەکی دیکەی (ژیر) دەدەین، کە دیسان دێڕە شیعرێکی (گۆران)ە:

| (گاف ژێ) | بەفرمێسکی | پەشیمانی |
| --- | --- | --- |
| | ب - - - | ب - - - |
| | ئەی زوهرەی ناز | زووهرەی جوانی |
| | - - - - | - - - - |

دەتوانین هەر نیوە دێڕێکی شیعرەکە بەئاسانی بەسەر (٢) هەنگاوی (٤) بڕگەییدا دابەش بکەین. بەڵام پێش ئەوەی چەند کەناڵێک لەبابەتەکە بکەینەوە، بێ سوود نییە لە ڕوانگەی بۆچوونەکانی (ژیر)ەوە تێبینییەک لەبارەی هاوکێشیی نموونەکەوە تۆمار بکەین.

(ژیر) لەو تێگەیشتنەوە کە «مۆسیقای هەڵبەستەکە» تەنیا هاوکێشیی هەنگاوەکان پێکی دەهێنێت، هەوڵ دەدات جیاوازیی نێوان بڕگەکان لە ڕێگای کورتکردنەوەی چەند بڕگەیەکی درێژەوە، یان بەپێچەوانەوە، چارەسەر بکات.

لە زمانێکی وەکو کوردیدا، کە چەندێتیی بڕگەکان ئەرکێکی فۆنیمی دەگێڕێت، هەر دەستکارییەکی وا، دەتوانێت زیان بەئاستی سیمانتیی وشەکان بگەیەنێت. لە نموونەکەدا (٢) بار بۆ هاوکێشکردنی (هەنگاو)ەکان لەبەر دەستدان، یەکەمیان بەدرێژکردنەوەی بڕگەی یەکەمی هەنگاوەکانی نیوە دێڕی یەکەم، دووەمیشیان بەکورتکردنەوەی بڕگەی یەکەمی هەنگاوەکانی نیوە دێڕی دووەم. لە باری یەکەمدا، بڕگەی هەنگاوی یەکەم لە (ئامراز)ێکەوە دەبێت بە(ناو): (بە- با). گۆڕانی بڕگەی هەنگاوی دووەمیش واتای وشەکە بەتەواوی دەگۆڕێت. ئەو کردەیە، لە نیوە دێڕی دووەمیشدا دووبارە دەبێتەوە. ئەگەر لە ئاستی هەموو بڕگەکانی نموونەکەشدا ئەو هەوڵە بدرێت، هەر هەمان ئەنجامی

دەبێت. کەواتە هاوکێشیی سیمانتیی هەنگاوەکان جێبەجێ نابێت. لە ڕاستیشدا ئەو جیاوازییانە پێوەندییان بەئاستی کێشەوە هەیە لە ئاستی ڕیتمدا ئەوەندە گرنگ نین.

ئێستا هەوڵ دەدەین هۆی ڕەوانیی شیعرەکە، نەک لە ڕێگای ڕاکێشان و گرژکردنەوەی بڕگەکانەوە، بەڵکو لە سنووری چەندێتیی خۆیاندا ڕوون بکەینەوە.

ئەگەر وەکو (٢) هەنگاوی عەرووزی سەرنجی نیوە دێڕی یەکەمی نموونە (گاف ژێ) بدەین، دەبینین هەمان سیستێمی (تەفعیلە)ی (هەزەج – مەفاعیلون) یان هەیە، واتە هەر هەنگاوێک لە (وەتەد)ێکی کۆ (ب –) و دوو(سەبەب)ی سووک (– –) پێکهاتووە.

وەکوو پێشتر بینیمان، (وەتەد) ناوکی مۆسیقایی هەنگاوە عەرووزییەکانە، کەواتە بڕگەی درێژی (وەتەد)ەکە بریتییە لەو دیاردە دەنگییەی لەو دوای هەنگاوەکاندا دووبارە دەبێتەوە و ڕیتمی شیعرەکە دروست دەکات، بەگوێرەی بۆچوونەکەی (مەندوور)یش ستریسێکی بەهێزی دەکەوێتە سەر:

(گاف ژی ١) (بە فرمێسکی) (پەشیمانی)

بەڵام لە نیوە دێڕی دووەمدا سیستێمێکی ڕیتمی جیاواز دەبینین، ئەمەش بۆ بنیاتی سیمانتیی نیوە دێڕەکە دەگەڕێتەوە کە لە ڕستەیەکی (بانگهێشتن- نداء) پێکهاتووە. لە ڕستەیەکی واشدا، ستریس هەمیشە دەکەوێتە بڕگەی یەکەم:

(گاف ژێ ٢) (ئەیَ زوهرەی ناز) (زوَهرەی جوانی)

ئێستا دەبێ کام یەک لە نیوەدێڕەکان سیستێمی ڕاستەقینەی شیعرەکە بێت؟ لە ڕاستیدا ئەم پرسیارە، شێوەیەکی وردتری پرسیارەکەی پێشترە لە بارەی پێوەرەکانی جیاکردنەوەی هەنگاوەکانی کێشی خۆماڵییەوە، کە ئێستا دەستبەجێ هەوڵی وەڵامدانەوەی دەدەین.

هەڵبژاردنی دێڕێکی دیکە لەو شیعرەی نموونە (گاف ژێ)ی لێ



وەرگیراوە، یارمەتییەکی زۆری وەڵامدانەوەی پرسیارەکە دەدات:

(گاف میم)   تۆبی زەردەخـــەنەی چاوت

– – –   – ب ب –   – –

لێـوی بە عـاسـتـەم تۆراوت[٥٠].

– –   – ب – –   – – –

هەر هەوڵدانێک بۆ هەنگاوی (٤) بڕگەیی لە نموونە (گاف میم)دا، ڕووبەڕووی بەرگرییەکی توندی یەکە سیمانتییەکان دەبێت، کە تەنیا لە ڕێگای هێرشێکی ڕاستەوخۆی عەرووزییەوە تێک دەشکێنرێت. بۆ ئەوە؛ ئەم وێنانەی خوارەوە ڕیز دەبەستن:

| | | | |
|---|---|---|---|
| (گاف میم١) | (تۆبی) (زەردە خەنەی) (چاوت) | = | (٢+٤+٢) |
| | (لێوی) (بەعاستەم) (تۆراوت) | = | (٢+٣+٣) |
| (گاف میم٢) | (تۆبی) (زەردە خەنەی چاوت) | = | (٢+٦) |
| | (لێوی) (بەعاستەم تۆراوت) | = | (٢+٦) |
| (گاف میم٣) | (تۆبی زەردە خەنەی) (چاوت) | = | (٦+٢) |
| | (لێوی بەعاستەم) (تۆراوت) | = | (٥+٣) |

ئەگەر سەرنجی دابەشکردنی نموونە (گاف میم ١) بدەین، دەبینین لەسەر بنچینەیەکی (مۆرفۆ–سیمانتی) دابەشکراوە، کە سەربەخۆیی و واتادارێی یەکەکانی تێدا ڕەچاوکراوە.

هەردوو نموونە (گاف میم ٢، گاف میم ٣) پتر لایەنە سیمانتییەکانیان پێشخراون، بەڵام هێزی ڕستە لە نموونە (گاف میم ٢)دا، خراوەتە سەر (خود)ی بەیامگر، کە لە شیعرەکەدا کەسی دووەمی تاکە، کەچی لە نموونە (گاف میم ٣)دا هێزەکە خراوەتە سەر ئەندام و ئاوەڵناوەکانی پەیامگر.

ئێستا دەتوانین وەڵامێکی سەرەتایی لەبارەی نموونە (گاف ژێ)ی ڕابردۆوە گەڵاڵە بکەین: لەبەر ئەوەی هەموو دێڕەکانی شیعرەکە بەسەر

هەنگاوی (٤) بڕگەییدا دابەش ناکرێن، سیستێمی بڕگەبەندیی نموونەکە لەگەڵ تێکڕای سیستێمی شیعرەکەدا لە ئاستی کێشدا ناگونجێت، لە ئاستی ڕیتمیشدا نموونە (گاف ژێ ٢) لەگەڵ ئەو دوای دێڕەکاندا تەبایە[٥١].

ئەوە وەڵامی بەشێکی پرسیارەکەی پێشووتر بوو کە دەتوانین لە ڕوانگەی باسەکانی دواییەوە لەم شێوازەی خوارەوەدا دایڕێژینەوە:

- کام یەک لە نموونەکانی (گاف میم ١، گاف میم ٢، گاف میم ٣)، نزیکترین دابەشکردنی هەنگاوی کێشی خۆماڵییە؟

وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە گرنگە، پێوەندیی بەڕوونکردنەوەی ئەم دوو خاڵەی خوارەوە هەیە:

١- پێناسەکردنی (یەکەی ڕیتمی).

٢- دەستنیشانکردنی سروشت و جێگای (وەستان)ەکان.

ئەو دوو خاڵە بەشێکن لە بابەتەکانی فەسڵی داهاتوو، کە بریتییە لە دوا هەوڵی باسەکە بۆ پێشنیازکردنی وێنەیەکی جیاواز بۆ سیستێمی ڕیتم لە کێشی خۆماڵیدا.

بەراوردکردنەکانی ئەم کەرتە، دوو جیاوازییان لەنێوان کێشی خۆماڵی و کێشی عەرووزیدا پیشان دا:

(یەک): لە ئاستی کێشدا، دەرکەوت (یەکە) کێشی خۆماڵی بەهەمان ژمارەی (یەکە) کانی کێشی عەرووزی، لە (یەکە)ی ڕیتمیدا کۆنابنەوە.

(دوو): لە ئاستی ڕیتمیشدا، دیاردە دەنگییەکانی ڕیتم لە کێشی خۆماڵیدا: (بڕگەی سترێسدار)، هەمان سیستێمی دیاردە دەنگییەکانی ڕیتم لە کێشی عەرووزیدا: (بڕگەی درێژ)یان نییە.

## ٢- ٥: ئاوڕێکی پێچەوانە بەرەو مێژوو...

پێش ئەوەی دوایی بەم فەسڵە بهێنین، بەرەنگاری دوا سەنگەرەکانی بڕگەیی بوونی سیستێمی ڕیتم لە کێشی خۆماڵیدا دەبینەوە. لەم



بوارەشدا ڕا و بۆچوونی ژمارەیەک لەو ڕۆژهەڵاتناسانە بەسەر دەکەینەوە کە لەگەڵ بۆچوونەکانی (جاکسۆن، کریستنسن، بەنڤینست)دا جیاوازییەکی بنەڕەتییان هەیە.

ئەم خشتەیەی خوارەوە، کە لەسەر بنچینەی زانیارییەکانی فەسڵی سێیەمی کتێبەکەی (د. خانلەری) داڕێژراوە، سیستێمی کێش لە زمانە (هیندۆ ئەورووپاییەکان)دا چڕ دەکاتەوە:[٥٢]

| ز | زمان | سیستێمی ڕیتم | خاوەنی بۆچوون | ل |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ڤیدایی | چەندێتیی بڕگەکان | د. ڕاجا | ٣٣ |
| ٢ | سانسکریتی | = = | بیروونی | ٣٤ |
| ٣ | گریکی | = = | نۆگاریت | ٣٥ |
| ٤ | لاتینی | = = | | |
| ٥ | ئەنگلۆ – سەکسونی | سترێس | مییێ | ٣٨ |
| ٦ | ئاڤێستا – زمانە | سترێس | مییێ | ٤٣ |
| | ئێرانییەکان | بڕگە | بەنڤینیست | ٤٧ |

خشتەی (٢-٣)
(سیستێمی کێش لە زمانە (هیندۆ- ئەورووپاییەکاندا)

زانیارییەکانی ناو خشتەکە گەلێ ڕوون و ئاشکران، زۆربەی سیستێمەکان لەسەر بنچینەی جیاوازیی بڕگە کورت و درێژەکان دامەزراون، سیستێمی سترێسیش لە پلەی دووەمدایە.

لە خوارووی هەموو جۆرەکانەوە، سیستێمی شیعرەکانی (ئاڤێستا) و (زمانە ئێرانییەکان) لەنێوان دوو بۆچوونی جیاوازدا هەڵواسراون.

ئەم پیشاندانە، وەکو (د. خەزنەدار) پاش پێداچوونەوەی فراوانی مێژووی ئەو کێشانە وتوویەتی «شتێکی بەکەڵکە بۆ دۆزینەوەی بناغەی کێشی شیعری کوردی، بناغەیەکی خۆماڵی»[٥٣].

گرنگیی ئەو ئاماژەیەی سەرەوە لەوەدایە پشت بەمێژووی دێرینی

سیستێمی شیعری ئەو خێزانە زمانانەی (کوردی) ئەندامێکیانە، سیستێمی رووتی برگەیی لە گۆشەیەکی تەنگدا حەشاردەدات.

ئەگەر لە روانگەیەکی فۆنێتیکییەوە لە (برگە) و (سترێس) بروانین، دەبینین ئەو دوو ئەدگارە گرنگەی زمان زۆر جار بناغەیەکی هاوبەشیان هەیە.

لە هەر زمانێکدا (سترێس) ئەرکێکی فۆنیمی بگێرێت، چەندێتیی برگەکان لەو زمانەدا رۆڵێکی رێزمانییان دەبێت، سەرەڕای ئەوەش، هەر دوو دیاردەکە لە ئەدگارە ناسراوەکانی زمانە (هیندۆ- ئەوروپاییەکان)ن.

یەکەمین ئاماژەکردن بۆ سیستێمی سترێس لە شیعرەکانی (ئاڤێستا)دا، بۆچوونەکەی (ئەنتوان مییێ)یە، کە رادەگەیەنێت کێش لە ئاڤێستادا تەنیا لەسەر سترێسی بەهێز دامەزراوە(٥٤).

ئەو بۆچوونە لەلایەن (هەنینگ) و پاشتریش (کریستنسن)ەوە بەبەڵگەی پتر پاڵپشتیی لێوە کراوە.

(کریستنسن) لە ئەنجامی دەسکەوتی لێکۆڵینەوە تازەکان لە بارەی شیعری (ئاڤێستا) و (پەهلەوی)یەوە، رادەگەیەنێت ئامادەیە بۆچوونەکەی (هەنینگ) بسەلمێنێت کە بەلایەوە شیعری (پەهلەوی) نە چەندی بووە و نە ژمارەیی، بەڵکو کێشراو بووە و بەس، بەڵام (کریستنسن) ئەو رایە بەشێوەیەکی دیکە دەردەبرێت و دەڵێت شیعری (پەهلەوی) و شیعری کۆنی ئێرانی لەسەر بنچینەی سترێس دارێژراون(٥٥).

ئەو شێوە پۆلینکردنانە، لە چەرخی تازەشدا بەردەوامن.

پرۆفیسور (مار) لە بارەی شیعرە فۆلکلۆرییەکانی ناوچەکانی ئێرانەوە دەڵێ: «خۆم بەردەوام گوێم لێگرتوون و لە بارەی برگەییبوونی تەواویانەوە گەلێ دوو دڵم»(٥٦).

لە دواییشدا (خانلەری) خۆی، لە ئەنجامی شیکردنەوەی کۆمەڵێ



شیعری گۆرانییە فۆلکلۆرییەکاندا، بەو ئەنجامە گەیشتووە کێشی ئەو شیعرانە نە برگەییە و نە عەرووزی، بەڵکو بنیاتی کێشیان لەسەر بناغەی چەندێتیی برگەکان و سترێس دامەزراوە، هەرچەند چەندێتیی برگەکان وەکو سترێس جێگیر و بنبڕ نییە(٥٧).

رەنگە چاکترین وتە لەم بوارەدا بتوانێت تێکڕای ناونیشان و بۆچوونەکانی ئەم فەسڵە چڕ بکاتەوە، لە هەمان کاتیشدا پتەوترین بەردەبازبێت بۆ پەڕینەوە بۆ فەسڵی داهاتوو، ئەم دەقە بەنرخەی خوارەوە بێت پرۆفیسور (قەناتی کوردۆ) لە پێشەکیی کتێبەکەی (د. خەزنەدار)دا تۆماری کردووە:

«... بەلای منەوە، لە کێشی شیعری کوردیدا، بیرکردنەوە لە (النبرە) شتێکی فەرزە، پێویستە پسپۆڕانی کورد لەگەڵ ئەم پرسەشدا خەریک بن، هەروەکو کێش رووداوێکی تایبەتییە لە شیعری کوردیدا، هەروەها نەبرەش رووداوێکی ترە ماوەی ئەوەی هەیە کە لە وتارێکی درێژ، یا لە کتێبێکدا لیی بکۆڵرێتەوە، چونکە شیعری خەڵکی کورد (فۆلکلۆر)، ئەوەی بە(بانگ) کێشراوە بەپێی نەبرە دێتە گۆرانی وتن»(٥٨).

بەراستی (کوردۆ) بەو بۆچوونەی چرایەکی بچووک، بەڵام لە هەمان کاتدا یەکجار بەتینی هەڵکردووە.

شیکردنەوەکانی ئەم فەسڵە رێگای ئەوە دەدەن کێشی خۆماڵی وەکو کێشێکی نەچەندی و نەبرگەیی- سەر لە نوێ پۆلین بکەینەوە و بنیاتی ریتمەکەی بەگوێرەی سترێسی زمانی کوردی، دیاری بکەین. ئەو هەوڵەی لە فەسڵی داهاتوودا لەم بارەیەوە دەدرێت، بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کراوە.

---

(١) لە هەڵبژاردنی پێناسەکاندا، لایەنی مێژوویی: (بۆ بەراوردکردنی رادەی گۆڕان، یان وەستانی بۆچوونەکان) و: پێوەندییان بەلایەنە تیۆرییەکانی فەسڵی پێشوو (وەکو مەشقێکی پراکتیکی) و: نوێنەرایەتییان لە دەستەیەکی فراوانی

بۆچوونەکان لەم بارەیەوە، ڕەچاو کراون.
(٢) ژیان، ژمارە (٢٧)، ١٩٢٦.
(٣) دیوانی سەلام، ل٢٤-٢٥.
(٤) شەفەق، ژمارە (١٠)، ١٩٥٨.
(٥) فن الشعر، ص٥.
(٦) Academic American Encyclopedia, P: 204.
(٧) ڕەخنە سازی، ل١٩٢-١٩٣.
(٨) فن الشعر، ل٦٨.
(٩) ڕخنە سازی، ل١٩٤.
(١٠) سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٢.
(١١) اشارات أولیه فی الشعر الترکی، ص٤٠.
(١٢) صوت الاتحاد، ص٧.
(١٣) الوزن والقافیه والشعر الحر، ص٧٢.
(١٤) سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣. واتای شیعرەکە، لە وەرگێڕانە عەرەبییەکەوە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:
فورویکی: کۆنە گۆل/ کاوازو: بۆق/ میزو: ئاو.
ئوتو: دەنگ/ یا: بەڵێ      توبیکومو: بازدەدات.
نو: ئامرازی خستنەسەر.
(١٥) سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤.
(١٦) سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢.
(١٧) گۆرانی یاترانەهای کوردی، ل١٣.
(١٨) فۆنەتیک، ل٧٨.
(١٩) علم الاصوات، ص١٧٧ .
(٢٠) سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٦.
(٢١) سەرچاوەی پێشوو.
(٢٢) لە گەلێ وشەی کوردیدا، ئەو جیاوازییە چەندییانە، لە نموونەی وەکو (دەر- دار)، (کوڕ- کووڕ) و (ژن- ژین) هتد، دەبنە هۆی ڕوودانی جیاوازیی ڕێزمانیی کە پاڵ بەقسەکەرەوە دەنێت ماوەیەکی پتر بەو ڤاوڵانە ببەخشێت بۆ ئەوەی گوێگر واتاکان لە یەکتر جیا بکاتەوە، ئەمەش دۆخێکی فۆنیمی بەچەندێتیی ڤاوڵ لە زمانی کوردیدا دەبەخشێت.
(٢٣) سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٨-١٦٩.
(٢٤) نظریة الانواع الادبیة، ص٥٩-١٦٠.
(٢٥) الادیب المعاصر، ص٧.
(٢٦) المذاهب الادبیة الکبری في فرنسا، ص١١٠.
(٢٧) نظریة الانواع الادبیة، ص٦٧. جێگای (وەستان) ەکان لە شیعری (فەرەنسی)دا، بەگوێرەی قۆناغە ئەدەبییەکان تووشی گۆڕان و دەستکارییەکی فراوان هاتووە. بەنموونە، شیعری (١٢) بڕگەیی کە بە(ئەلیسکەندەران) ناسراوە، لای کلاسییەکان لە (٤) هەنگاوی (٣) بڕگەیی پێک دەهات، بەڵام لە قۆناغی ڕۆمانتیکیدا بەتایبەتی لەلایەن (هۆگۆ) وە، بوو بە(٣) هەنگاوی (٤) بڕگەیی. لەگەڵ (بەرتران) و (بۆدلێر)یشدا، بەئەندازەیەک لاواز دەبێت دێڕە شیعرییەکان بەگوێرەی تیۆرییەکەی (پوالۆ)، لە پەخشانێکی ڕووت نزیک دەبنەوە.
(٢٨) موجازەرەکان.
(٢٩) في المیزان الجدید، ص١٨٠.
(٣٠) سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٩.
(٣١) The Phonemic System of Modern Standard Kurdish, P: 84.
(٣٢) في المیزان الجدید، ص١٨٠.
(٣٣) ژین، ژمارە (٢٤)، ١٩٧١.
(٣٤) سەرچاوەی پێشوو.
(٣٥) بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا، ل١٧٩.
(٣٦) نزیکیی هەردوو سیستێمەکە، لە پاشکۆی ژمارە (٢)دا بە ڕوونی دەردەکەوێت.
(٣٧) گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات.
(٣٨) برایەتی، ژمارە (١٠)، ١٩٧١.
(٣٩) ئەژماری کێشە عەرووزییەکان و ڕێژەی سەدییان لە پاشکۆی ژمارە (٣)دا دەبینرێت.
(٤٠) الموسوعة العربیة المیسرة، ص١٢٠٩.
(٤١) في المیزان الجدید، ص١٨٤.
(٤٢) سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٥.

(٤٣) لە نموونەی دەستوورەکانی:
- ابراهيم انيس، الاصوات اللغوية، ط ٣، القاهرة، ١٩٦١، ص١١٨- ١٢٣.
- عبد الصبور شاهين، علم الاصوات، تأليف برتيل مالمبرج، القاهرة، ١٩٧٧، ص٢٠١-٢٠٩.
داود عبده، دراسات في علم اصوات العربية، مؤسسة الصباح ص١٠٧-١٢٦ .
(٤٤) في البنية الايقاعية للشعر العربي، ص٤٢٢.
(٤٥) دەستەیەکی دیکە لە ڕۆژهەڵاتناسەکان، لە پێش هەمووشیانەوە و(ئیڤاڵد) کە (مندور) خۆی ئاماژەی بۆ دەکات، سەرەڕای زۆربەی نووسەرە عەرەبەکان هەمان بۆچوونیان هەیە.
(٤٦) کاروان، ژ (٧٢)، ١٩٨٩.
(٤٧) بزوێنی دووەمی هەنگاوی (کش و مات)درێژە، لە خوێندنەوەشدا هەستی پێ دەکرێت. جگە لەوەش وشەی (مات) لە بزواوێک ودوو نەبزواو پێکهاتووە، کە لە عەرووزدا نیشانەی (/ەە)ی بۆ دادەنرێت.
بەوەش نیوە دێڕی یەکەمی نموونەکە- ئەگەر وەکو شیعرێکی عەرووزی تەماشای بکەین- دەبێتە (هەزەجی شەش هەنگاویی مەقسور: مەفاعیيلون/ مەفاعیيلون/ مەفاعیيل).
(٤٨) کاروان، ژ (٧٢).
(٤٩) هاوکاری، ژ (٩٢٩)، ١٩٨٧.
(٥٠) دیوانی گۆران، ل٤٠.
(٥١) لە کۆمەڵی (٣٢) نیوە دێر کە شیعرەکەیان لێ پێکهاتووە، تەنیا (٤) نیوە دێڕی: (٥، ١١، ٢٢، ٢٤) بەبڕگەی کورت دەست پێدەکەن کە لەگەڵ سیستێمی نموونە (گاف ژی ١)دا جووتیان دەکات، بەڵام لە هەمان کاتدا لە ڕێگای سترێسە بەهێزەکانیانەوە هەمان سیستێمی نیوە دێڕەکانی دیکە وەردەگرن.
بڕوانە: دیوانی گۆران، ل٣٩-٤٠.
(٥٢) وزن شعر فارسی، ص٣٣-٤٧.
(٥٣) کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، ل١٤- ١٥.
(٥٤) وزن شعر فارسي، ص٤٣.
(٥٥) سەرچاوەی پێشوو، ل٤٩.
(٥٦) سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤.



(٥٧) سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣. (خانلەری) لەم بوارەدا بەگەڵێ ئەنجامی بایەخدار گەیشتووە کە دووپاتکردنەوەی ڕۆڵی بنیاتیی (سترێس) لەکێشی شیعرە میللییەکاندا گرنگترینیانە. بەڵام زاڵبوونی ڕێبازی عەرووزی- کە پەیمانێکی درێژخایەنی لەگەڵ شیعری (فارسی)دا بەستووە- بەسەر شیکردنەوەکانیدا، ناچاری کردووە لە بەرەو پێشچوونیدا چاوێکی هەر لە نموونە عەرووزییەکەوە بێت.
(خانلەری) لە کاتێکدا بەراوردکردنی عەرووزی (عەرەبی) و (فارسی) بەو ئەنجامەی گەیاندووە (تەفعیلە) کان بەسەرچەند کەرتێکی بچووکتردا دابەش بکات بۆ ئەوەی لەگەڵ وشە (فارسی)یەکاندا- کە بەزۆری (١، ٢، ٣) بڕگەیین- جووت بن (ل١٠٠)، نەیتوانیوە دوور لە چەمکی (هەنگاو)ە هاوکاتە عەرووزییەکان و مەترسیی کەرتکردنی وشە سەربەخۆکان، لە نموونە شیکراوەکانی شیعری میللی بڕوانێت (ل٧٠-٧٢).
(٥٨) کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، ل٩.

# فەسڵی سێیەم

## بنیاتی ڕیتم لە شیعری فۆلکلۆری کوردیدا

* چمکێکی ڕۆڵی سترێس لە زمانی کوردیدا
٣-١ جۆرەکانی شیعری فۆلکلۆری.
٣-٢ سیستێمی ڕیتم لە شیعرە بێ کێشەکاندا.
٣-٣ سیستێمی ڕیتم لە شیعرە کێشراوەکاندا.
٣-٤ دارشتنەوەی نموونەکان.

**چەمکێکی ڕۆڵی سترێس لە زمانی کوردیدا:**

هەرچەن شیکردنەوەکانی فەسڵی پێشوو، چەندێتیی جیاوازی برگەکانی زمانی کوردیان دووپات کردەوە، لە هەمان کاتدا هیچ مەیلێکی زمانەکەیان بۆ بەکارهێنانی ئەو ئەدگارە لە شیعردا نەنواند[١]، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت سوود وەرنەگرتنی شیعری زمانێک لە ئەدگارێکی زمانەکە، بەڵگەی نەبوونی تەواوی ئەو ئەدگارە نییە، بەڵکو بەو واتایەیە ئەو ئەدگارە لە زمانەکەدا زاڵ نییە، لەبەر ئەوە شیعرەکە پشت بەئەدگارێکی دیکە دەبەستێت لەگەڵ سروشتی زمانەکەدا پتر ڕێک بکەوێت.

کە دەڵێین کورتی و درێژیی برگە هیچ ڕۆڵێکی بنەڕەتی لە کێشی خۆماڵیدا ناگێڕێت، تەنیا بەو واتایەیە برگە کورت و درێژەکان بەگوێرەی سیستێمێکی وەکو کێشی عەرووزی ڕیزنەکراون. بەو شێوەیە، شیعری کوردی ناچار بووە لە ڕێڕەوی مێژوویی خۆیدا، ملکەچی زاڵترین ئەدگارەکانی زمانی کوردی بێت کە دوور لە کارتێکردنی سیستێمەکانی دیکە بەکاریهێناون.

لە بواری شیعری جیهانیشدا، دەبینین شیعری ئینگلیزی و ئەڵەمانی بەنموونە، برگە و چەندێتیی برگە بنیاتی ڕیتمەکەیان دروست ناکات، بەڵکو سترێس ئەو پێویستییەدابین دەکات؛ چونکە سترێس لەو دوو زمانەدا ئەدگارێکی گرنگی زمانەکە و ڕۆڵێکی فۆنیمی دەگێڕێت.

بەرامبەر بەو سیستێمانەش، شیعری (چینی) ئەدگارێکی دیکەی زمان بەکاردەهێنێت کە لە زۆربەی زمانەکاندا بەکاردەهێنرێت، بەڵام لە زمانی چینیدا ئەدگارێکی سەرەکی و فۆنیمییە. بەنموونە، واتای وشەیەکی وەکو (chu)، پێوەندیی بەئاوازەی دەربڕینی وشەکەوە هەیە کە دەتوانرێت بەبەرزکردنەوە و نزمکردنەوەی پلەی ئاوازەکان، چوار واتا لە یەکتر جیا بکرێتەوە[٢]. دیاردەیەکی واش، بەناچاری دەچێتە بنیاتی ڕیتمی شیعرەکەوە.



بۆیە دەبینین شیعری (چینی)، جگە لە (قافیە) و ژمارەی برگەکان، بەرزی و نزمیی ئاوازەکانیشیان بۆ بەرجەستەکردنی ڕیتمەکەی بەکاردەهێنێت[٣].

لەم ڕوانگەیەوە، دەتوانین بپرسین: سیستێمی کێشی خۆماڵی چ ئەدگارێکی زمانی کوردی بۆ دامەزراندنی بنیاتی ڕیتمەکەی خواستووە؟

ئەو پرسیارە بەجۆرێکی دیکەش ئاراستە دەکرێت: کام ئەدگاری زمانی کوردی گرنگییەکی تایبەتیی هەیە و لە پێویستییەکانی ئاخاوتنی کوردییە؟

ئەگەر سەرنجێکی خێرا ئاراستەی ئەو کارانە بکەین لە بارەی زمانی کوردییەوە پێڕەوییان لە ڕێبازێکی زانستی کردووە، کەمتر دەبینین لایەکیان لە (سترێس)[٤] نەکردبێتەوە.

لێرەدا پێویست ناکات هەموو ئەو وتار و باسانە بەسەر بکەینەوە کە دوور و نزیک ئاماژەیەکیان بۆ ئەو ئەدگارەی زمانی کوردی کردووە، بەڵکو گرنگترین ڕاو بۆچوونەکان لەم بارەیەوە بەکورتی دەخەینە ڕوو، مەبەستیش ئەوەیە بنچینەیەکی تیۆری بۆ بابەتەکانی ئەم فەسڵە دابڕێژین.

دەتوانین بیر و ڕاکانی (تۆفیق وەهبی)، بەڕوونترین ئاماژە بۆ ڕۆڵی گرنگی سترێس لە زمانی کوردیدا، بژمێرین.

ئەو، لە فەسڵی یەکەمی (ڕێزمانی کوردیدا)، باسی دوو جۆر لە سترێس لە زمانی کوردیدا دەکات: سترێسی (وشە) و سترێسی (دووپاتکردنەوە–Contrastive stress).

لە بواری سترێسی دووپاتکردنەوەدا، کە بەڕوونی ڕۆڵی بنیاتی سترێس لە زمانی کوردیدا پیشان دەدات، ئەم دوو دۆخەی خوارەوە بۆ واتای ڕستەی: «قازەکان لە جۆگەلەکەدان)، کە سترێسی دووپاتکردنەوە واتاکەی دەگۆڕێت، لێکدەداتەوە:

١- ئەگەر ستریس بخەینە سەر (قازەکان)، ڕستەکە ئەوە دەبەخشێت تەنیا (قازەکان) لە جۆگەلەکەدان.

٢- ئەگەریش ستریسەکە بخرێتە سەر (جۆگەلەکە)، ڕستەکە وا دەگەیەنێت قازەکان لە (جۆگەلەکە)دان و لە جێگایەکی دیکەدا نین.

وەکو دەبینین، بێ گۆڕینی وشەکان، پلەی ستریس واتای ڕستەکانی گۆڕی. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت زمانی کوردی لە کاتێکدا ناتوانێت بەگۆڕینی سیستێمی سینتاکسی، واتای ڕستەکان بگۆڕێت، بەدووپاتکردنەوەی یەکێک لە وشەکان- هەر لە جێگای خۆیدا- ئەو ئەرکە ئەنجام دەدات.

ئەمە لە زمانێکی وەکو عەرەبیدا بەپێچەوانەوەیە، هەر بەبەکارهێنانی وەرگێڕانی عەرەبییەکەی (تۆفیق وەهبی) بۆ هەمان ڕستە، دەبینین زمانی عەرەبی لە ڕێگای گۆڕینی سیستێمی سینتاکسیی ڕستەکەوە، واتاکەی دەگۆڕێت:

١- الاوزات فی الساقیه (بۆ واتای یەکەم).

٢- فی الساقیه الاوزات (بۆ واتای دووەم).

لەبەر ئەوە (تۆفیق وەهبی)، ڕەچاوکردنی ستریس بەپێویستییەکانی ئاخاوتنی کوردی دادەنێت[٥].

ڕەفتارکردنی (ئی. ئێن. مەکارۆس) لەگەڵ فۆنەتیکی کوردیدا، تێگەیشتنێکی بالآ لە گرنگیی ڕۆڵی ستریس لە زمانەکەدا پیشان دەدات. لە هەر جێگایەکدا باسی ڤاوڵی کردبێت، بەهێزی، یان بێ هێزیی ستریسەکەی ڕەچاو کردووە.

(مەکارۆس) لە (ڕێزمانی کوردی)دا، کە بەشی دووەمی بۆ (فۆنۆلۆژی) تەرخان کردووە، پاش ئەوەی ئاماژە بۆ فۆنیمایەتیی ستریس لە کوردیدا دەکات، دوو جۆریان لێ باس دەکات: ستریسی وشە: (فەرهەنگی) و ستریسی (فرەیز).

گرنگیی کارەکەی (مەکارۆس) لە ڕوانگەی مەبەستەکانی ئێمەوە، لەو



هەوڵەدایە بۆ داڕشتنی چەند دەستوورێک بۆ دەسنیشانکردنی جێگای ستریس لە هەندێ لە بەشەکانی ئاخاوتنی کوردیدا پێشکەش کردووە، کە لە جێگای خۆیاندا کەڵکیان لێ وەردەگرێت.[٦]

لە بەرهەمەکانی (هەورامانی، ئەوڕەحمانی حاجی مارف، غازی فاتیح وەیس... هتد) بایەخێکی شایستە بەستریس و ئەرکە بنچینەییەکانی لە زمانی کوردیدا دراوە و گەلێ زانیاری بەنرخ لەو بارەیەوە تۆمار کراون[٧].

دەتوانین فەسڵی چوارەمی نامەی دوکتۆرییەکەی (د. عەبدولمەجید)، کە بۆ ستریس لە زمانی کوردیدا تەرخان کردووە، بەکارێکی پێگەیشتوو لەم بوارەدا بژمێرین.

(د. عەبدولمەجید) لەو فەسڵەدا، وەکو زۆربەی ئەوانەی ئاوڕیان لەو لایەنە داوەتەوە، دوو جۆری ستریس دەسنیشان دەکات: ستریسی (وشە) و ستریسی (فرەیز). لە هەردوو بوارەکەشدا، چەند دەستوورێکی داڕشتووە، زۆربەی لایەنەکانی ئەو دوو جۆرەیان گرتۆتەوە.

بەڵام دیارترین کەموکوڕی لە هەموو ئەو کارانەدا، لەو خاڵەدا ڕەنگی داوەتەوە هیچیان بەلای سروشتی ستریس لە وشەکانی نێو ڕستە و شێوەکانی گۆڕانی لە دۆخە جیاوازەکانی ئاخاوتندا نەچوونە، کە ڕاستەوخۆ پێوەندییان بەشیکردنەوەکانی ئێمەوە هەیە.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو کارانە دوو خاڵی سەرەکییان چەسپاندووە:

(یەک) ڕۆڵی گرنگی ستریس لە زمانی کوردیدا.

(دوو) داڕشتنی چەند دەستوور و یاسایەک بۆ ستریسی وشە و ستریسی فرەیز.

### ٣-١ جۆرەکانی شیعری فۆلکلۆری

وێنەی قۆناغە مێژووییەکانن...

لە فەسڵی یەکەمدا ئاماژەمان بۆ ئەو بناغە هاوبەشە کرد شیعر و

مۆسیقایان لەسەر پێکهاتبوو، لێرەدا پێویستە ڕوون بکرێتەوە کە مەبەست لەو شیعرە شیعری کێشراو بوو.

لەم کەرتەدا، چەند قۆناغێک بەرەو ڕابردووی ئەو شیعرە دەگەڕێینەوە، قۆناغێک هێشتا مرۆڤ لەژێر زەبری پێویستییەکانی کاری ڕێکخراودا، بیری بەلای ڕێکخستنی ئامرازەکانی کار و دەربڕیندا نەچووبوو.

زۆربەی لێکۆڵینەوەکان لە بارەی مێژووی شیعری نەتەوەکانەوە، دەیسەلمێنن ئەو شیعرانە سەرەتایەکی یەکجار سادە و ناڕێکیان هەبووە.

(هێربەرت ڕید) لە بەراوردکردنێکدا لەنێوان شیعر و قۆناغی سەرەتایی مێژووی مرۆڤدا، دەقێکی (میشێل فۆکۆ) بەبەڵگە دەهێنێتەوە و تیایدا شیعر بەیەکەمین شێوەی مێژوو و میتافیزیکیای ئەو مرۆڤە دەژمێرێت کە لە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆی هەستی لەگەڵ دەوروبەردا دەژیا، پێش ئەوەی هەوڵی هۆنینەوەی (بیـــر) و بابەتە گشتییەکان بدات[٨].

لەو ڕوانگەیەوە، دیارترین ئەدگارەکانی هونەری سەرەتایی، لە ڕیتمدا- نەک لە کێشدا- پتر دەردەکەوێت، تەنانەت لە مۆسیقاشدا کە مەیلێکی سروشتی بەلای ڕێکخستندا پیشان دەدات، لەلای زۆربەی گەلە سەرەتاییەکان ڕیتم لە ئاواز زاڵترە[٩].

لە بواری شیعری سەرەتاییشدا، یان سەرەتای شیعردا، ئەو زانیارییە مێژووییانەی پێمان گەیشتوون، هانی بیرکردنەوە لە شیعرێکی ڕێکخراوی سەرەتایی نادەن.

بە نموونە، شیعری (ئەکەدی)و (سریانی) کێشیان نەبووە و لە ڕێگای ستریسەوە ڕیتمەکەیان ڕەچاوکراوە، ئەمە لە شیعری (حەبەشی) و (فیرعەونی)یشدا هەروا بووە[١٠].

هەموو سروود و لاواندنەوەکانی وەکو (میزمار) ەکانی (داود)و شیوەنەکانی (ئەشعیا) و (سروودی سروودان)و ... هتد، پەیام لە شیعرێکی بێ کێشی قافیەدار دەدەن[١١].



لە شیعری عەرەبیشدا، کە زۆربەی نموونەکانی ئاماژە بۆ چاودێری کردنێکی وردی کێش دەکەن، گەلێ نموونەی وەکو (معلقە) کەی (عبید بن الابرص) دەبینرێن، لەگەڵ ڕێبازەکەی (خەلیل)دا ڕێک ناکەوون[١٢].

نووسەرێکی وەکو (سعید الغانمی)یش هەوڵی داوە چەند شیعرێکی سەردەمی پێش ئیسلام بەپێوەری سیستێمە جیاوازەکانی شیعری جیهانی تاقیکاتەوە، لە ئەنجامدا لەگەڵ هیچ یەکێک لەو سیستێمانەدا نەگونجاوون، بۆیە بڕیار دەدات شیعرەکان کێشیان نییە.

پاش ئەو قۆناغە، لەگەڵ گەشەکردنی زانیارییەکانی مرۆڤ و دەرکەوتنی شارستانییە گەورەکاندا، ئەو ناڕێکییەی شیعریش لە چوار چێوەی گشتیی ڕێکخستنی شتەکاندا شەقڵی هونەرییان پتر پێوە دیاری دا. لەگەڵ ئەوەشدا، لە قۆناغی نێوان شیعری بێ کێشی سەرەتایی و شیعری ڕێکخراو و قافیەداری قۆناغی شارستانیدا، وێنەیەک دەبینرێت هەردوو دیاردەکەی لەگەڵ یەکتردا تێدا چاودێری کراون.

ڕەنگە چاکترین نموونە بۆ ئەو قۆناغە ناوەنجییە، ئەو پارچە پەخشانانەبن هەندێ لە (گاتا)کانی (ئاڤێستا) لە یەکتر جیا دەکەنەوە[١٣].

ئەو پێشەکییە تیۆرییە، بناغەیەکی زانستیانەتر بۆ پۆلینکردنەوەی جۆرەکانی شیعری فۆلکلۆریی کوردیی ئامادە دەکات.

٣-١-١ ئەگەر لە ڕوانگەی قۆناغە مێژووییەکانی پێشوەوە سەرنجی (گۆرانی) و (بەیت) و (لاوک و حەیران) بدەین، دەبینین بەگوێرەی سیستێمی ڕیتمەکانیان ئەم پێکهاتنانەی خوارەوەیان هەیە:

**(ئەلف) گۆرانی**: شیعری گۆرانیی فۆلکلۆری، تەنانەت بێ دەسنیشانکردنی (یەکە) کانی ڕیتمیشی، لە هەندێ دۆخی دەگمەندا نەبێت، بەوردی هاوکێشیی نیوە دێڕەکانی تێدا پارێزراوە.

لە (قافیە) شدا، نیشانەی هەستێکی هونەری دەبینرێت کە ناتوانین

دوور لە کارتێکردنی شیعری ڕێکخراوی قۆناغە تازەکان لێی بڕوانین.

**(بێ) بەیت**: لە (بەیت)ەکاندا، ئەو ئەدگارانەی (گۆرانی)، بەو ڕێکییە نابینرێن. بەدەربڕینێکی وردتر، لە پاڵ هاوڕیتمیی نزیکی ئەو دوو جۆرە دا، هاوکێشیی تەواوی دێرەکانی (بەیت) خۆی ئاشکرا ناکات. تەنانەت وا ڕوودەدات لە (بەیت)دا «بەشێک لە گێڕانەوەکان بەشیعر دەبن و هەندێکیشیان بەپەخشان»[١٤].

ئەو ئازادییە ڕێژەییە لە بەکارهێنانی کات و جێگادا- کە لە ڕاستیدا بۆ سروشتی فراوانی (بەیت) دەگەڕێتەوە- سەرەڕای تێکدانی کاتی هەمیشەیی، کە لە شیعری گۆرانیدا ڕەچاو کراوە، لە ڕاستیدا ئاماژە بۆ قۆناغێکی ڕۆشنبیری دەکات هەستی هۆنینەوە تێیدا بەو ئەندازەیە گەڵاڵە نەبووە هەموو نیازەکان لە دەرەوەی پەخشاندا ڕێک بخرێن، هەرچەن ئەو پەخشانە گیانێکی شیعریشی تێدا بێت.

(تێ) لاووک و حەیران: لە (لاوک و حەیران)دا، (کات)ەکان سنووریان تێکدەچێت. لێرەدا کاتی خودی، کاتی هەمیشەیی، کاتی گێڕانەوە، هەموویان لە بۆڵەی کاتی موتڵەقی شیعریدا دەتوێنەوە.

سیستێمی (بەند)ەکان، شەبەنگێکی هەمەڕەنگی دووبارەکردنەوەی هەندێ دەنگ و وێنەی سەرەکی، سەربەستیدان بەزرمەیەکی دەنگیی بەهێز لە دەوروبەری مەڵبەندە سیمانتییەکاندا، ئەمانە هەموو بەشداریی کارلێککردنێکی بەتینی هەڵچوون و دەربڕین و مۆسیقا دەکەن، کە لەگەڵ سەرەتاییترین ڕەگەزەکانی ئارەزوودا گرێ دراون. ئەو هەمە ڕەنگییە لە دووبارەکردنەوەی وێنەی هاوتەریب و ڕستەی هاوفۆنیم، تایبەتمەندییەک بە(قافیە)ی کوردی دەبەخشن، دەیکەن بەکەرتێکی بنیاتی ڕیتمی شیعرەکان و کێشی خۆماڵی پتر وەکو ڕووکەشێکی ستاتیکی بەکاری دەهێنێت.

لەم خشتەیەی خوارەوەدا، سروشتی ڕەگەزە دەنگییەکانی شیعری فۆلکلۆری پیشان دراوون:



| ز | جۆرەکان | کێش | ڕیتم | قافیە |  |
|---|---|---|---|---|---|
|  |  |  |  | هونەری | ڕواڵەتی |
| ١ | شیعری گۆرانی | + | + | + |  |
| ٢ | بەیت | + | + | + | + |
| ٣ | لاوک و حەیران |  | + |  | + |

خشتەی (٣-١)
(جۆرەکانی شیعری فۆلکلۆری بەگوێرەی ڕەگەزە دەنگییەکانیان)

وەکو دەبینین، ئاستەکانی کێش و ڕیتم لە شیعری گۆرانیدا بەڕوونی دیارن، بەرامبەر بەوە، (حەیران و لاوک) هیچ دیاردەیەکی هاوکێشی پیشان نادەن، بەڵام هەموو قورساییان لە ئاستی ڕیتمدا دەرکەوتووە. لەنێوان هەردوو جۆرەکەشدا، (بەیت) بەشێک لە ئەدگاری هەر یەکێکیانی تێدایە، بەڵام سروشتی دوو ڕەگیی زمانەکەی، ئاستەکانی کێش و ڕیتمی پێکەوە لکاندووە.

(قافیە)کان هێمایەکی سەیر بۆ قۆناغی جیاوازی مێژوویی و پلەی ڕۆشنبیریی ئەودیوی جۆرەکان دەکەن. لە کاتێکدا لە (حەیران و لاوک)دا (قافیە)ی ڕواڵەتی، واتە دووبارەکردنەوەی هەمان دەنگ لە کۆتایی ڕستە شیعرییەکاندا، سیمای سەرەکیی (قافیە)یە، لە شیعری گۆرانیدا، ڕەچاوکردنێکی هونەریانەتری (ڕەوی) دەبینرێت. (بەیت)ەکانیش، بەدەستووری ئاساییان، وەکو ڕەگەزێکی دوولانە، لە هەردوو جۆرەکەیان تێدایە.

سەرنجەکانی سەرەوە، ڕێڕەوی مەبەستەکان بەرەو ئەنجامێک دەبەن کە (حەیران و لاوک)بەدێرنترین جۆری شیعری فۆلکلۆری کوردی بژمێرین.

بە دەربڕینێکی گشتیتر، جۆرەکانی شیعری فۆلکلۆری بەهەموویانەوە دۆخێکی یەکگرتووی مێژوویی پێک دەهێنن کە لە ڕێگای هەمەڕەنگیی سیستێمەکانیانەوە، وەڵامی زۆربەی مەبەستەکانی مرۆڤی کوردیان داوەتەوە.

ڕەنگە ئەمە- تا ڕادەیەک- ئەو دیاردە سەیرە لە مێژووی شیعری کوردیدا لێک بداتەوە کە هیچ کێشێکی دەرەکی، نەیتوانیوە بنکەیەکی هەمیشەیی لەنێو ڕیزەکانی شیعری کوردیدا داگیر بکات.

دەتوانین جۆرەکانی شیعری فۆلکلۆریی کوردی لەم زنجیرەیەی خوارەوەدا ڕیز بکەین:

(حەیران و لاوک) ← بەیت ← (شیعری گۆرانی)

ئەوەش وێنەیەکی تەواوە لە ڕیزکردنەکەی (د. خەزنەدار)، لە (مێژووی ئەدەبی کوردی تازە)دا، کە لە هێمایەکی ڕوونی مێژوویی دوور نییە.

لێرەوە، بۆ دەسنیشانکردنێکی بابەتیانەی بنیاتی ڕیتم لە شیعری فۆلکلۆریدا، پێڕەوی لەو ڕیز بەستنەی سەرەوەی جۆرەکانی شیعرەکە دەکەین.

هەنگاوێکی وەکو ئەوە، یارمەتییەکی پێویست بەدۆزینەوەی سیستێمە گەشەکردووەکانی دواتر پێشکەش دەکات، بەڵام پێش ئەوەی دەست بەشیکردنەوەی جۆرەکانی شیعرەکە بکەین، پێویستە تێبینییەک لەبارەی جۆری یەکەمەوە: (حەیران و لاوک)، تۆمار بکرێت.

وەکو زانراوە، لە زۆربەی باس و لێکۆڵینەوە فۆلکلۆرییەکاندا (حەیران)و (لاوک) بەیەک بابەت دانراون، جیاوازیی ناوەکانیشیان بۆ هۆکارێکی ناوچەیی گێڕاوەتەوە. ئەمە ئەگەر لە ڕووی ڕوخساری هەردوو بەشەکەوە تەماشای بکەین زۆر ڕاستە، بەڵام لە ڕووی (بابەت)ەوە نێوەرۆکێکی جیاوازیان هەیە.

لە کاتێکدا (حەیران) پتر نێوەرۆکێکی دڵداریی هەیە، دەبینین (لاوک) سەرەڕای ئەو لایەنە، بەسەرهاتی مێژوویی و قارەمانێتیشی تێدایە، ئەو دوو لایەنییەی (لاوک) زۆر جار دەبێتە هۆی لەنێوچوونی سنوورەکانی لەگەڵ (بەیت)یشدا.

کەواتە چ پێوەرێک بۆ جیاکردنەوەی سنوورەکان بەکار بێنین؟



ئەوەندەی پێوەندیی بەباسەکەی ئێمەوە هەبێت، سیستێمی ڕیتمی لەگەڵ بنیاتی سیمانتیدا، ڕێکترین پێوەرن؛ چونکە وەکو زانراوە، بنیاتی ڕیتمیی هەر شیعرێک، پێوەندییەکی بنچینەیی بەبنیاتی سیمانتیی شیعرەکەوە هەیە. بنیاتی سیمانتیش، بەئەندازەی یەکەم هاوڕەگی بابەت و نێوەرۆکی شیعرەکەیە، کە بەهەموویانەوە هەڵوێستی پەیامدەر سەبارەت بەدەوروبەر بەرجەستە دەکەن.

لەو ڕوانگەیەوە، دەتوانین هاوسیستێمیی جۆرە هاوبابەتەکان پێشبینی بکەین. بەگوێرەی ئەم بڕیارە، هەموو ئەو شیعرانەی بابەتێکی دڵدارییان هەیە و پێوەندیی نێوان پەیامدەر و پەیامگر پێوەندییەکی ڕاستەوخۆیە، بەکورتی هەموو بابەتە(خود)ییەکان لەیەک خانەدا پۆلێن دەکرێن.

لە لایەکی دیکەوە، هەموو بابەتە سوارچاکی و قارەمانێتی وتەنانەت داستانە دڵدارییەکان، کە پێوەندیی نێوان پەیامدەر و پەیامگر لە دەرەوەی (خود)ی بابەتەکەدا دادەمەزرێت، بەوشەیەک هەموو شیعرە مێژووییەکان لە خانەیەکی جیاوازدا دادەنرێن.

ئەو پۆلینکردنە، لایەنێکی فراوان لە ئاڵۆزیی هەر شیکردنەوەیەکی زانستیانە دوور دەخاتەوە، لە هەمان کاتیشدا ڕێگا بۆ داڕشتنێکی وەکو ئەمەی خوارەوە خۆش دەکات:

| شیعری خودی (لیریک) | | شیعری خودی (لیریک) | |
|---|---|---|---|
| بێ کێش | کێشراو | بێ کێش | کێشراو |
| (حەیران) | (گۆرانی) | (لاوک) | (بەیت) |

خشتەی (٣-٢)
جۆرەکانی شیعری فۆلکلۆری بەگوێرەی بابەت و سیستێمی کێشەکانیان

بەو شێوەیە، ئاسۆی شیکردنەوەکان بەڕادەیەک ڕووناک دەبێتەوە، هیچ مەترسییەک لە تێکەڵبوونی بابەتەکان، لە دوایشدا سیستێمی ڕیتمەکانیان، پەیدا نابێت.

بە مەبەستی پاراستنی یەکێتیی تەکنیکیی باسەکان و ڕەچاوکردنی زنجیرە مێژوویییەکانی جۆرەکان، لە پێشدا شیعرە بێ کێشەکان و لە دواییشدا شیعرە کێشراوەکان شیدەکەینەوە.

### ٣-٢ سیستێمی ڕیتم... لە شیعرە بێ کێشەکاندا:

٣-٢-١ حەیران: (حەیران) وێنەیەکی سادەمان لە گۆڕانکارییەکانی ڕەگەزەکانی زمان پیشان دەدات. لێرەدا ڕەگەزێکی ڕیتمیی وەکو ستریس، کە لە ڕوونترین شێوەدا کاردەکات، بەهۆی فشاری پێویستییەکانی ڕێکخستنەوە ناچار نابێت جێگا، یان پلەی خۆی بگۆڕێت.

لە ئاستی سیمانتیشدا، زاڵبوونی ڕستەیەکی سەرەکی بەسەر ئەو دوای ڕستە لاوەکییەکاندا، دەبێتە هۆی ئاوێتەبوونێکی ئۆرگانیکی لەنێوان هەردوو ئاستی دەنگ و واتادا.

لەم دەقەی خوارەوەدا، کە نموونەیەکە لە تۆمارکراوەکانی (ئار. ئێس. سۆلێکی)، ئەو تێبینیانە بەشێوەیەکی ڕوونتر دەردەکەون (١٥):

«حەیران ئەورۆ سبیانێ ............................................ (٧) برگە
دەچمەوە سەر گردی سەرخمێ ...................................... (٩) =
لەبەر خەمی پیرە دونیایێ ......................................... (٩) =
گەلەک بلند و چاو دەگێڕم لە هەموو ............................. (١٢) =
ئەرێ براییینە دەڵێم چاودەگێڕم لە دوو هەموو بنارێ ......... (١٩) =
گەلی براییینە برادەرینە من نازانم ............................... (١٥) =
بەژنی باریک و دووچاوی ڕەشکۆکە .............................. (١١) =
چوویتە دەرێ لە گوندی ............................................. (٧) برگە
لە بۆ هەراش کردنێ ................................................. (٧) =
لە بۆ کۆزی بەرخان »................................................. (٦) =

سەرنجێکی سەرپێیی لە ژمارەی برگەی دێڕەکان، پیشانی دەدات



ئاستی کێش، بنیاتی مۆسیقایی دەقەکەی مۆسیقایی دەقەکەی دا نەڕشتووە. لە دۆخێکی واشدا، مەڵبەندی قورسایی ئاهەنگی شیعرەکە، لە ئاستی ڕیتمدا دەردەکەوێت.

ئەگەر بمانەوێت بنیاتی ڕیتمی دەقەکە بەوردی دەسنیشان بکەین، پێویستە سەرەتا لە شیکردنەوەی بنیاتی سیمانتی و دیاریکردنی بزووتنەوەی گشتیی دەقەکەوە دەست پێبکەین. بۆ ئەم مەبەستەش، دەبێ ڕێژەی فرمانەکان و ڕاناوەکانیان لە چوارچێوەی کاتی شیعرەکەدا دەسنیشان بکرێن کە دەتوانین بەم شێوەیەی خوارەوە دیاریان بکەین:

| (فرمان) | (ڕاناو) | (کات) |
|---|---|---|
| (دەچمەوە) | (کەسی یەکەمی تاک) | (ئێستا) |
| (دەگێڕم) | (=) | (=) |
| (نازانم) | (=) | (=) |
| (دەڵێم) | (=) | (=) |
| (چوویتە) | (کەسی سێیەمی تاک) | (ڕابردوو) |

وەکو لەسەرەوەدا دیارە، ڕاناوی کەسی یەکەمی تاک، زاڵبوونی خۆی بەسەر زۆربەی فرمانەکاندا سەپاندووە. ئەو دیاردەیە هەموو هێزێکی پەیامە شیعرییەکە لە دەوری پەیامدەردا کۆ دەکاتەوە، واتە پەیامەکە لە (خود)ی پەیامدەرەوە ئاراستەی پەیامگر دەکرێت، بەڵام لەبەر ئامادە نەبوونی پەیامگر، پەیامەکە بەمەبەست ناگات و جارێکی دیکە لە دۆخی سەرسوڕمان و هەناسەساردیدا بەرەو (خود)ی پەیامدەر دەگەڕێتەوە.

ئەم بزووتنەوە بازنەییەی پەیامەکە، سیستێمێکی داخراو بەبنیاتی ڕیتمەکەش دەبەخشێت، بەو شێوەیە، پەیامدەر دەبێتە مەڵبەندی سیمانتی لە دەقەکەدا و پەیامگر دەبێتە تەنیا خولگەیەکی هێمایی بۆ سۆز و هەڵچوونەکانی پەیامدەر.

بەڵام ئەو دۆخە، لەگەڵ مەبەستی بنەچەیی پەیامدەردا ناگونجێت کە دەیەوێت لەو بازنە داخراوە دەرچێت.

بەو شێوەیە، پەیامدەر لەنێوان دوو هێزی ڕاکێشەردا دەبزوێت: لە لایەکەوە (ئامادە نەبوون)ی پەیامگر وای لێ دەکات بەناچاری بەدەوری (خۆ)یدا بخوولێتەوە، لە لایەکی دیکەشەوە تەکان دەدات لەو خوولانەوەیە (خۆ)ی دەرباز کات.

ئێستا با بزانین ئەو بنیاتە ناکۆکە، چۆن لە بنیاتی ڕیتمیدا ڕەنگی داوەتەوە؟.

دابەشکردنەکەی پێشوو یارمەتیمان دەدات بەئاسانی (ڕیتمی واتا) لە دەقەکەدا دەسنیشان بکەین. بەدەربڕینێکی سادە تر، دەتوانین مەڵبەندی ڕیتم لە ڕستە شیعرییەکاندا لە ڕێگای فرمانە بەهێزەکانەوە دیاری بکەین: (دەچمەوە، دەگێڕم، نازانم). ئەم دەسنیشانکردنە بواری ئەوە دەدات ڕستەی سەرەکیی دەقەکە: (گەڕان بەشوێن خۆشەویستدا))، بەسەر ئەم سێ ڕستەیەی خوارەوەدا دابەشکەین:

١- (حەیران ئەوڕۆ سبیانێ «دچمەوە» سەر گردی سەر خمێ).

٢- (لەبەر خەمی پیرە دونیایێ گەلەک بلّند و چاو«دەگێڕم»لە هەموو).

٣- (من «نازانم» بەژنی باریک و دوو چاوی ڕەشکۆکە... هتد).

وەکو دەبینین، ڕستە شیعرییەکان، لەگەڵ جیاوازییاندا لە داڕشتنی هاوتەریبیی فرەیزەکان و دەرنەکەوتنی دیاردە دەنگییە هاو فۆنیمەکان، بەهۆی ئەو سێ مەڵبەندە ڕیتمییە بەهێزەوە ڕیتمی واتاییان دابین کردووە.

بەڵام ئەو ڕیتمە، کە دەرکێشراوی لایەنی یەکەمی بنیاتە سیمانتییەکەیە: (بزووتنەوەی بازنەیی)، لەگەڵ هەوڵدانی پەیامدەردا بۆ دەرچوون لەو بازنەیە، لە ناکۆکیدایە، ئەمەش بەناچاری دەبێ لەو بنیاتەدا ڕەنگ بداتەوە.

هەوڵدانی پەیامدەر و تێکشکاندنی ئەو بازنەیە، لە ڕێگای دووبارە



کردنەوەی شێوازێکی مۆرفیمییەوە خۆی دەنوێنێت، کە دەتوانێت ڕیزەکانی مەبەستە پەنگخواردووەکانی وەکو (گەڕانی نا ئومێدانە، سەرلێشێواوی) و بەکورتی هەموو ئەو مەبەستانەی بازنەی داخراوی ڕستە لاوەکییەکان ئابلۆقەی داوون، بەتوندی ببڕێت.

ئەو شێوازە مۆرفیمییە، بریتییە لە دەستەواژەی وەکو (برایینە، برادەرینە... هتد) کە پەیامدەر لە ڕێگایانەوە هەوڵ دەدات دەروویەک بکاتەوە. بەو شێوەیە، هاوسەنگییەک لە نێوانی ڕستە لاوەکییە بەهێزەکان- کە بنیاتی داخراویان پێکهێناوە- و دەستەواژە تێکدەرەکان- کە بنیاتی دەربازبوونیان بەرجەستەکردووە، دروست دەبێت. ئەمەش دوو مەبەست لە بنیاتی سیمانتیدا بەدی دەهێنێت کە ئەم نەخشەیەی خوارەوە سیماکانیان دەنوێنێت:




نەخشەی (٣-١) بنیاتی ڕیتمی و سیمانتی لە (حەیران)دا.

هەموو ئەو خاڵانەی لە شیکردنەوەکەی پێشوودا ئاماژەیان بۆ کرا، لە نەخشەکەدا بەڕوونی دەرکەوتوون و پێویست بەدووبارەکردنەوەیان نییە. ئێستا دەبێ شوێنەواری دەرکەوتنی ڕیتمی واتایی، لە ڕیتمی دەنگیدا دەسنیشان بکەین.

ئەگەر سەرنجی ڕستەلاوەکییەکان بدەین، دەبینین هەر ڕستەیەک مەڵبەندێکی ڕیتمیی بەهێزی تێدایە کە کرۆکی سیمانتیی ڕستەکەیە. لە کۆتایی هەر ڕستەیەکیشدا، مۆرفیمێک هەمیشە بەڤاوڵێکی درێژ دوایی دێت، ئەو ڤاوڵەش لەبەر ئەوەی کۆتایی بەڕستە شیعرییەکە دەهێنێت، ئاسایی بەهێز دەبێت.

بەو شێوەیە، بنیاتی داخراوی سیمانتی، لە ڕێگای ئەو مەڵبەندە بەهێزانەوە سیستێمی خۆی دەپارێزێت.

لە بەرامبەردا، پەیامدەر بۆ دەرچوون لەو بازنە بەهێزە، پێویستیی بەهێزێکی پتر هەیە، لەبەر ئەوە دەبینین دەستەواژەکان بۆ هەر کەلەبەرتێکردنێکی ئەو دیوارە، شێوازی هێرشبردنی (٣: ١، ٢: ١) بەکاردەهێنن، ئەمەش بەڕوونی لە نەخشەکەدا دیارە.

دەتوانین پوختەی شیکردنەوەکانی پێشوو، لەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:

(**یەک**) بنیاتی سیمانتی لە دەقەکەدا، بنیاتێکی بازنەییە لەو دوو بزووتنەوە پێکهاتووە:

یەکێکیان بزووتنەوە بنەچەییەکەیە، کە بەشەکانی ڕستەی سەرەکی دایانڕشتووە. دووەمیشیان بزووتنەوەی تێکدەری بزووتنەوەی یەکەمە.

(**دوو**) ئەو بزووتنەوانە لە ڕێگای دوو جۆری دووبارەکردنەوە لە بنیاتی دەنگیدا ڕەنگ دەدەنەوە:

یەکەمیان دووبارەکردنەوەی فۆنیمییە، کە دەتوانین ناوی (قافیەی سترێس)ی لێ بنێین؛ چونکە فۆنیمەکانی کۆتایی ڕستە لاوەکییەکان،



ئەوەندەی بەهۆی سترێسی بەهێزەوە ئەرکی ڕیتمیی خۆیان دەگێڕن، ئەوەند بایەخ بەهاوەدەنگی نادەن.

دووبارە کردنەوەی دووەم مۆرفیمییە و لە ڕێگای چەند فرەیزو دەستەواژەیەکی وەکو (برایینە، برادەرینە...) هتد[١٦]

بنیاتی ڕیتمی واتایی لە بنیاتی ڕیتمی دەنگیدا بەرجەستە دەکات[١٧].

دەتوانین - ئەگەر بواری فراوانکردنەوەی دوو ئەنجامەکەی سەرەوەمان هەبێت- بڵێین هەموو ئەو شیعرە فۆلکلۆرییە بێ کێشانەی لە خانەی شیعری (خود)یدان، هەمان بنیاتی بازنەیی سیمانتی و سیستێمی داخراوی ڕیتمییان هەیە[١٨].

٣- ٢- ٢ لاوک: تەکنیکی (لاوک)، لەو ڕووەوە کە مەودایەکی کاتی و پانتاییەکی ڕوودانی فراوانی هەیە، تا ڕادەیەکی زۆر لە تەکنیکی (چیرۆک) نزیک دەبێتەوە.

ئەوەی لە (لاوک)دا پتر سەرنج ڕادەکێشێت، سروشتی ناڕاستەوخۆ ئاراستەکراوی پەیامەکەیە. ئەم سروشتە، پەیامگر: (سوارچاک، ئەویندار... هتد) ڕادەکێشێتە ڕیزی پێشەوەی ڕووداوەکان و پەیامدەر: (لاووکبێژ) لە سێبەری پەیامەکەدا ڕادەگرێت. بەڵام ئەو ڕۆڵبەندییە، وا بەسادەیی و ڕاستەوخۆ لە (لاوک)ەکەدا دەرناکەوێت، بەڵکو لە پێشدا بەپاڵێوگەی پێوەندییە ئاڵۆزەکانی نێوان چەمکی (پەیام- چیرۆک) و (پەیامدەر- پەیامگر) و (کاتی مێژوویی- کاتی گێڕانەوە) و گەلێ پێوەندیی دیکەی نێوان بنیاتە جیاوازەکانی (لاوک)دا، تێدەپەڕێت.

لە ئەنجامیشدا، سروشتی ڕاستەقینەی هەر یەکێک لە پەیامدەر و پەیامگر دەگۆڕێت و هەر یەکەیان هێما بۆ کەسایەتییەکی تازە دەکەن.

بە نموونە، پەیامدەر: (لاوکبێژ)، ئەدگاری (خود)یی خۆی لە دەست دەدات و دەبێتە نوێنەری (ئاگایی کۆمەڵ)، پەیامگریش لە بەکەری

ڕاستەقینەوە، کە قارەمان لە (کاتی مێژوویی)دا بەرجەستەی دەکات، دەبێت بەبەرکار و (گوێگر) لە (کاتی ڕاستەقینە)دا دەبێت بەبکەری تازە.

سیستێمی (بەند)ەکانیش، بەپێچەوانەی (حەیران)، ڕەگەزەکانی تەنیا لە دەوری هەڵچوونە سنووردارەکاندا کۆنابنەوە کە (بەند)ەکان جیا دەکەنەوە، بەڵکو لە زنجیرەیەکی پەیژەییدا دەبزوێن و هەر (بەند)ێک دەبێت بەهەڵقەیەکی گەیەنەر لەنێوان هەڵقەکانی پێش و پاشی خۆیدا. ئەمەش، بەگشتی پێکهاتنێکی کراوە بەبنیاتی سیمانتی دەبەخشێت.

بەو شێوەیە، سروشتی گێڕانەوە لە (لاوک)دا، سیستێمێکی ئاسۆیی بۆ بنیاتی ڕیتمیی پێکدەهێنێت.

لەم سیستێمەدا، ئیدی پێویست بەدووبارەکردنەوەی شێوازێکی دیاریکراوی مۆرفیمی نییە: (دەستەواژەکان لە حەیراندا) بۆ تێکدانی سیستێمێکی چەسپاو؛ چونکە هەر دەستە مۆرفیمێک بەشێک لە واتای گشتیی دەقەکە هەڵدەگرێت، هەر بەشێکیش لەوی پێشوو بەهێزتر و واتا هەڵگرتر دەبێت.

ستریسی شیعر، بۆ ئەوەی بتوانێت لەگەڵ سروشتی کراوە و فراوانی بنیاتی سیمانتیدا تەبابێت، لە سنووری تاکە (بەند)ەکان دەردەچێت و بەسەر تەواوی پانتایی دەقەکەدا بڵاو دەبێتەوە و لە پێناوی پەڕینەوەی ڕیتمەکە بۆ (بەند)ەکانی پاشتر، واز لە بەشێک لە هێزی ڕاستەقینەی خۆی دەهێنێت. ئەمەش بەردەوامییەک بەڕەوتی ڕیتم دەبەخشێت کە تەنانەت بۆشایی نێوان (بەند)ەکانیش، ڕۆڵی بەردەبازی ڕیتمی دەگێڕن.

ئێستا هەوڵ دەدەین هەندێ لەو لایەنانەی ئاماژەمان بۆ کردن، لەم دەقەی خوارەوەدا- کە بەشی یەکەمی (لاوکی چەتۆ)یە (١٩)، بدۆزینەوە:

«سبەیە سبە زووە/ ١ سبەیە سبە زووە/ ٢
چەتۆیێ ئاغایێ گران لە خەوێ شیرین ڕابووە/ ٣



بسێ بانگا گازی شیرنێ دەلالێ خۆ کردیە/ ٤
کچکێ دینێ دەلالێ شیرنێ مال خراپێ/ ٥ ئەمان چما ئەتوو نزانی/ ٦ ئەمن ئەوشۆکە خەونەکی گەلە گەورە و قەبیعاتم دیتیە/ ٧
ئەمان لخەونێ مندا وە بیە/ ٨
تۆزەکێ قالبێ من تێک چووە/ ٩
نارەنارەک و نرکە نرکەک لە سینگی من دەرپەڕیە/ ١٠
کە تیتەوە ناوچەمیە/ ١١
چەند کیرۆشکێ لە لانانە/ ١٢
چەند شێرێ لە بیشانە/ ١٣
چەند کەوێ سەر هێلکانە/ ١٤
چەند ڕێویێ لە چۆمانە/ ١٥
چەند حەیوانێ لە دەخلان و لە بەڕیان و لە بەحرانە/ ١٦
فەرخێ خۆو هێلکێ خۆو کلکێ خۆیان وەدەوێ خۆ گرتینە/ ١٧
کچکێ دەلالێ مال خراپۆ/ ١٨ لعاردێ بێ دەرێ دەشتێ مەلیک سینۆیێ کەتینە/ ١٩
ئەمان تەیرو تارێ بەگۆشتێ وان دەعبایان و بەرازان هەموو خەنی بووینە/ ٢٠
لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ لێ لاوۆ
عەگیدێ سەرێ مەیدانێ بابێ مستێ لۆڕم زراوۆ»

بۆ ئەوەی بتوانین ئاستی سیمانتی و ئاستی دەنگیی دەقەکە دەسنیشان بکەین، پێویستیمان بەپۆلینکردنێکی وردتری بەشەکانی ئەو ئاستانە هەیە، لەبەر ئەوە هەوڵ دەدەین لە سێ تەوەردا لە دەقەکە بڕوانین:

**(یەک)** تەوەری ڕێزمانی: پێویستە لە پێش هەر کارێکی دیکەدا، سنووری ڕستە شیعرییەکان دیاری بکرێت؛ چونکە زۆربەی ئەو دەقە شیعرییانەی کێش سنووری ڕستەکانیان جیا ناکاتەوە، گەلێ جار لە

نووسیندا تێکەڵ دەکرێن، ئەمەش زیانێکی دوولانە بەئاستی سیمانتی و دەنگی دەگەیەنێت.

ئەگەر سەرنجی دەقەکە بدەین- کە سنووری ڕستەکانمان جیا کردۆتەوە- دەبینین لە ژمارەیەک ڕستەی هاوتەریب پێکهاتووە. ئەم سیستێمە تا کۆتایی (بەند)ەکە، لە چوار چێوەی مەبەستە سەرەکییەکەدا، بەردەوام دەبێت.

لە ئاستی دووەمدا، کە ئاستی بنیاتی سیمانتیی ڕستە هاوتەریبەکانە، پەیامدەر: (لاوکبێژ) لە سەرەتادا لە چوار ڕستەی وەسفیدا، کاتی ڕووداوەکە و هەڵوێستی قارەمانەکە: (چەتۆ) و بێ ئاگایی خۆشەویستەکەی، پیشان دەدات.

لێرە بەدواوە، پەیامدەری یەکەم لادەکەوێت و کەسایەتیی ڕاستەقینەی خۆی لە دەست دەدات و لە ڕستەی پێنجەمەوە لە ڕێگای قارەمانەکەوە ڕووداوەکان بەسەردەکاتەوە.

ئەو گواستنەوە کارەکتەرییە، هێزێکی کارتێکردنی تازە بەگێڕانەوەکان دەبەخشێت کە لە سیستێمی کورتیاندا دەردەکەوێت: (ڕستەکانی: ٨، ٩، ١٠، ١١، ١٢، ١٣، ١٤، ١٥). هەر لەبەر ئەو سروشتەشیان، مەبەستەکان لە ڕستەیەکەوە بۆ ڕستەیەکی دیکە دەگوێزرێنەوە تا لە ئەنجامی کەڵەکەبوونیان لە ڕستەکانی (١٦، ١٧، ١٨)دا، بەهەموو هێزێکیانەوە لە ڕستەی ژمارە (٢٠)دا بەتاڵ دەکرێنەوە.

(**دوو**) تەوەری پەیامەکە: دەسنیشانکردنی پەیامی شیعرەکە، پێویستیی بەشیکردنەوەی هەموو (لاوک)ەکە هەیە، ئەوەش لێرەدا لە توانادا نییە، لەبەر ئەوە تەنیا پەیامی ناو دەقەکەی پێشوو شی دەکەینەوە، لە ڕاستیشدا بۆ مەبەستەکانی ئێمە، کە دەسنیشانکردنی سیستێمی ڕیتمییە، تا ڕادەیەک بەسە.

پەیامدەر، لەڕێگای دووبارەکردنەوەی(١٩) ڕستەی شیعرییەوە، هەوڵ



دەدات هەستکردن بەمەترسییەک ڕابگەیەنێت ڕەنگە تووشی قارەمانی نادیار: (مەلیک سینۆ) بووبێت. ئەم دەسنیشانکردنە ئەوە دەگەیەنێت لەو کاتەی وا دەزانین نێوەرۆکی پەیامەکە تەواو بووە، لە ڕاستیدا هەنگاوی یەکەمی ڕووداوەکان دەستپێدەکات: (مەلیک سینۆ) چیی لێهاتووە؟،

ئایا پێشبینییەکەی (چەتۆ) بەدی دێت؟ هەڵوێستی دوایی چی دەبێت؟... هتد. ئەمەش دەبێتە هۆی پاڵپێوەنانی ڕووداوەکان بەرەو (بەند)ەکانی دیکە.

(**سێ**) تەوەری هێماکان: پەیامەکە پێشبینییەکی تێدایە، لە دۆخێکی وەکو دۆخی شیعرەکەدا، تەنیا لەڕێگای خەونەوە شایانی باوەڕپێهێنانە.

لەبەر ئەوە دەبینین پەیامدەری ڕاستەوخۆ لەو ڕێگایەوە پەیامەکەی ڕادەگەیەنێت، لە کاتێکدا پەیامدەری ناڕاستەوخۆ، کە هەموو کون و قوژبنی ڕووداوەکان دەزانێت، ناتوانێت بێتە پێشەوە و شتەکان لەگێڕانەوەیەکی ئاسایی نزیک خاتەوە، بۆیە وەکو بینیمان هەر لە سەرەتای ڕستەی پێنجەمەوە دەکشێتەوە و جڵەوی ڕووداوەکان بەپەیامدەرێکی ڕاستەوخۆ دەسپێرێت کە خۆیشی بەشداریی هەڵسووڕاندنی ڕووداوەکان بکات.

بەو شێوەیە، هەر لە (خەون) ەکەوە کە بۆ خۆی هێمایەکی سەرەکییە، دەبینین ژمارەیەک هێمای لاوەکی: (کێرۆشک، شێر، کەو، ڕێوی... هتد) بۆ بەرجەستەکردنی نێوەرۆکی خەونەکە، ڕیزکراون.

دەتوانین بنیاتی سیمانتیی دەقەکە لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا دەسنیشان بکەین:

١- پێکهاتنی ڕێزمانیی دەقەکە لەژمارەیەک ڕستەی هاوتەریب پێکهاتووە.

٢- ڕستەکان هەرچەن سەرەتا و کۆتاییان هەیە، بەڵام واتاکانیان لەگەڵ تەواوبوونی دەقەکەدا تەواو نابێت.

٣- بنیاتی سیمانتی، لە دوو یەكەی گێڕانەوە پێكهاتووە: یەكەی سەرەكی كە پەیامەكەی تێدایە و یەكەی لاوەكی، كە وێنەكانی خەونەكە پێكی دەهێنن.

٤- دەقەكە دوو پەیامدەری تێدایە: پەیامدەری ڕاستەقینە، كە لە ڕێگای قارەمانی ڕاستەوخۆوە بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ پەیامەكە ڕادەگەیەنێت.

هەموو ئەو ئەدگارانەی بنیاتی سیمانتی ڕێگامان دەدەن ئەم خشتەیەی خوارەوە دارێژین:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| یەكەی سەرەكی | پەیامدەری نادیار | كاتی دەقەكە | پەیامەكە | ئەنجام |
| | لاوك بێژ | ئێستا | مەترسی | بەردەوام |
| یەكەی لاوەكی | پەیامدەری ڕاستەوخۆ | كاتی ڕاستەقینە | خەونەكە | ئەنجام |
| | چەتۆ | ڕابردوو | بەشەكانی خەونەكە | كۆتایی |

خشتەی (٣-٣)
یەكە سەرەكی و لاوەكییەكانی بنیاتی سیمانتیی (لاوك)

وەكو دەبینین، بنیاتی لە دوو یەكە پێكهاتووە و بەهەموو بەشەكانیەوە، بەتایبەتی بەشی دوایی، دوو جۆرە پێوەندی پێكدەهێنن كە سیمای تایبەتیی دەقەكە دەكێشن:

١- لە سەرێكەوە پێكهاتنێكی سەربەست كە لە سنووری دەقەكە دەردەچێت.

٢- لە سەرێكی دیكەوە، وەستانێكی (كاتی)، كە دوایی بەقۆناغێكی دەهێنێت و سەرەتای قۆناغێكی نوێ دیاری دەكات.

ئێستا هەوڵ دەدەین ڕادەی ڕەنگدانەوەی ئەو بنیاتە سیمانتییە لە بنیاتی ڕیتمیدا دەسنیشان بكەین.



ئەگەر سەرنجی مەودای ڕستە شیعرییەكان بدەین، دەردەكەوێت ڕستەكان تا دێت هەڵچوون و گرژ بوونەوەیان لە پەرەسەندندان، واتە جۆری سترێسەكان لە گۆڕاندایە.

لە ڕستەی (١) ەوە تا (٤)، سترێسی ڕستەیە، واتە هەر وشەیەك سترێسی خۆی بەوشەی دواتر دەبەخشێت تا لە كۆتایی ڕستەكەدا دوا وشە هەڵی دەگرێت، ئەمەش بۆ سروشتی ئاسایی گێڕانەوەی پەیامدەری ڕاستەوخۆی یەكەم دەگەڕێتەوە كە پاشان دەبێت بەنادیار.

لێرە بەدواوە، پلەی ئاوازەیی ڕستەكان بەرە و بەرزی دەچێت، بەڵام بێ ئەوەی لەڕێژەی سترێسەكان زیاد بكات، بەو شێوەیە سترێسی ڕستە بەردەوام دەبێت تاكۆتایی ڕستەی (١٥)یەم.

لە ڕستەی (١٦)ەوە، پەیامەكە لە تەواوبوون نزیك دەبێتەوە، بۆیە هەموو هێزی ڕاگەیاندنی، بەچڕی لەو ڕستەیە و ڕستەكانی دواتردا كۆدەبێتەوە.

ئەو پرۆسێسە، ڕێگا بەسترێسەكان دەدات لەسەر تەواوی پانتایی ڕستەكاندا سنگە ڕیتمییەكانی خۆیان بەتوندی داكوتن. بەوەش سترێس جۆری دەگۆڕێت و دەبێت بەسترێسی وشە: (فەرهەنگی)، كە لەگەڵ ئاوازەی بەرزی ڕستەكاندا یەكەی سەرەكیی سیمانتی بەوردی بەرجەستە دەكەن.

بەڵام وەكو لە خشتەكەدا بینیمان، یەكەی سەرەكی لە بنیاتی سیمانتییدا لە كۆتایی ڕستەی(٢٠)دا دوایی نایات، ئەمەش هەڵچوونەكان بەزیندوێتی ڕادەگرێت و وا لە گوێگر دەگەیەنێت گوێ لە گێڕانەوەیەكی ئاسایی ڕادەدیرێت.

لێرەوە دەبینین، دوو یەكەی ڕووتەڵی ڕیتمی:(دەستەواژەی: لێ لاوۆ...هتد) وەكو دوو ڕستەی مۆسیقایی، دەكرێن بەجێگری بنیاتی ناتەواوی سیمانتی و لە ڕێگای بڕینی وێنەییەوە، بەشێوەیەكی (كاتی)، دوایی بەبنیاتی سیمانتی دەهێنن.

شیکردنەوەکانی ئەم جۆرەی شیعری فۆلکلۆری دەیسەلمێنن، هەرچەندە ئەمیش وەکو (حەیران)، لە خانەی شیعرە بێ کێشەکاندایە، بەڵام بنیاتی سیمانتی و ڕیتمیی هەر یەکێکیان، سیستێمێکی جیاواز و سەربەخۆی هەیە.

**٣-٣ سیستێمی ڕیتم... لە شیعرە کێشراوەکاندا:**

٣- ٣- ١ بەیت: وەکو زانراوە، هەندێ لە (بەیت)ەکانی فۆلکلۆری کوردی، بنیاتێکی (شیعر- پەخشان)یان هەیە. دیارە سروشتی پەخشان لێرەدا، هەرچەن لەگەڵ بنیاتە سیمانتییەکەدا ئاوێتەیە، بەڵام ناگاتە پلەی پەخشانێکی هونەری لەگەڵ بنیاتە ڕیتمییەکەدا هاوڕەگ بێت.

لە بەرامبەردا، ڕستە شیعرییەکان سنوورێکی ڕوونی کێشیان پێوە دیارە کە هەرچەن جاروبار بەهۆی پێویستییەکانی ئاواز و هەڵەی نووسینەوە دێڕەکانیان هاوسەنگیی تەواو لە دەست دەدەن، بەڵام بەڕوونی ئاماژە بۆ ڕەچاوکردنێکی وریای کێش دەکەن. ئەو سروشتەی (بەیت)، لە شیعری گۆرانی نزیکی دەخاتەوە، لەکاتێکدا بنیاتی سیمانتیی پتر ئەدگارە گێڕانەوەییەکەی (لاوک)ی پێ دەبەخشێت.

لەم بەشەدا، خۆمان بەهەڵسەنگاندنی شیکردنەوەکانی (ئی. بی. سۆن)ەوە خەریک دەکەین، کە لە بارەی سێ بەندە شیعری (بەیت)ی (زەمبیلفرۆش)ەوە ئەنجامی داوە.

بە مەبەستی چڕکردنەوەی باسەکە، تەنیا بەندی یەکەمی (بەیت)ە کە بەنموونە دەخوازین[٢٠]:

(زێ سین)

Zambi´l feru´sh lauke ruva´la
Bakifle´t u a´hel u aya´la
Hu´sniya´ Yusif laba´la
Das la Kursi san’ atai

(سۆن) لە سەرەتادا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کێشی شیعرەکان، ئەگەر



بڕگەکان لەگەڵ دێڕ و ستریسەکاندا بەراوورد بکرێن، نارێکییەکی زۆریان تێ دەکەوێت، ئەو نارێکییەش تەنیا لە (ووتن- ئاواز)دا چارەسەر دەکرێت.

بەو شێوەیە، (سۆن) هەر لە سەرەتاوە بڕیار دەدات دێڕەکان لە قالبێکی مۆسیقاییدا دابڕێژێت تا لە چوارچێوەی (بار)ە هاوکێشەکاندا، بتوانێت ئەو لەنگییە ڕاست بکاتەوە.

ئەو ڕادەگەیەنێت شیعرەکە دەبێ لە ئاوازێکدا تێبینی بکرێت هەر (بار)ێکی لە (٣) زرمە پێکهاتبێت و گۆرانییەکەش بەسێیەمین زرمە دەستپێدەکات، بڕگە درێژەکانیش- یان ستریسدارەکان- لە یەکەمین زرمەدان.

ئەوجا لە نەخشەیەکدا، جێگای زرمەکان لەسەر بڕگەکان دەسنیشان دەکات و مەودای نێوانیان بەم شێوەیەی خوارەوە دیاریدەکات:

(زێ سین ١)

Line l: 3 1 2 3 1 2 3 1 2 3 1 2 3
Line 2: 3 1 2 3 1 2 3 1 2 3
Line 3: 1 2 3 1 2 3 1 2 3
Line 4: 1 2 3 1 2 3 1 2 3

لە بارەی ئەو جووتبڕگە کورتانەی لە نەخشەکەدا دەرکەوتوون، پێی وایە لە هەر دۆخێکی وادا، پێویستە بەبڕگەیەکی کورت دابنرێن کە دەکەوێتە نێوان دوو بڕگەی درێژەوە، وەکو لە شیعری ئەوروپاییدا باوە[٢١].

بۆ ئەوەی بتوانین بەشێوەیەکی دروست بۆچوونەکانی (سۆن) هەڵسەنگێنین، پێویستە لە پێشدا هەندێ بابەتی ڕووتی مۆسیقایی وەکو: ڕیتمی گۆرانییەکە، جۆری ئاوازەکەی... هتد ڕوون بکرێنەوە کە بۆ شیکردنەوەی شیعرەکەش بایەخێکی زۆریان دەبێت.

بەڕای هونەرمەند (وریا ئەحمەد)، (سۆن) وەکو هەر ئەوروپییەک

گوێی بەڕیتمی (٨/٥، ١٦/١٠)، کە (جۆرجینا)یە، ئاشنا نییە؛ چونکە ڕیتمە ڕۆژهەڵاتییە، بۆیە ئەوە گۆرانییەکەی بەڕیتمی (٣/٤) داناوە کە دۆخێکی (ڤالس)ە.. بەڵام گۆرانییەکە لە کوردستانی عیراقدا بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت:

(زێ واو)



(ووریا) دەڵێت: «بەگوێرەی دێڕەکانی (سۆن)، دوو (بار) لە ئاوازەکەدا زیاد دەبێت، مەبەستم هۆنراوەکە بەشی ناکات[٢٢].

بە مەبەستی بەراووردکردنی هەردوو ڕیتمەکە، پێویستە هەمان گۆرانی بەڕیتمی (٣/٤)یش بەنۆتەکراوی تۆمار بکەین. بۆ ئەو مەبەستەش، دەتوانین وێنەیەکی زۆر نزیکی ئاوازەکەی (سۆن)، لەم دەقە بەنۆتەکراوەی خوارەوەدا ببینین کە (جەمیلە جەلیل) بۆ بەندێکی دیکەی (بەیت)ەکەی داڕشتووە[٢٣].

ZEMBIL FIROS 5 npo ABEII KOP 3 NH

(زێ جیم)






بەراووردکردنی هەردوو نموونەکە لەگەڵ یەکتردا، لە دواییشدا گۆڕینەوەی زاراوە مۆسیقاییەکان بەزاراوەی شیعری، مەودایەکی یەکجار فراوان بۆ دەسنیشانکردنی بنیاتی ڕیتمی شیعری گۆرانی دەسازێنێت.

بۆ ئەوەی شیکردنەوەکان نەچنە قاڵبێکی مۆسیقایی ڕووتەوە، هەوڵەکانمان ئاراستەی بەراووردکردنی ئاستی ڕیتمی نموونەکان دەکەین وا لە خوارەوەدا ڕیتمی (جۆرجینا= ١٦/١٠) و ڕیتمی (ڤالس= ٣/٤)، کە هەردووکیان (ووریا)دایڕشتوون، تۆمار دەکەین:

(جیم)




ڤێ




وەکو دەبینین ڕیتمی نموونە (جیم) هەمان ڕیتمی (زێ واو= ١٦/١٠)یە.

بە دەربڕینێکی مۆسیقایی، هەر (بارێک) لە (١٠) زرمەی (دەبڵ کرۆش) پێکهاتووە.

ئەوەی لێرەدا گرنگ بێت کات و ژمارەی زرمەکان نییە: (کێش)، بەڵکو جۆری بەهێزی و بێ هێزیی ئەو زرمانەیە: (ڕیتم) کە دەتوانین لەم شێوەیەی خوارەوەدا دایڕێژین:

(جیم ١)

| دوم تە تەک دوم تەک | دوم تە تەک دوم تەک |
| --- | --- |
| بەهێز بێ هێز بێ هێز بەهێز بێ هێز | بەهێز بێ هێز بێ هێز بەهێز بێ هێز |

ڕیتمی نموونە (ڤێ)، کەهەمان ڕیتمی (زێ جیم) و ئاوازەکەی (سۆن)یشە، بریتییە لە ڕیتمی (٣/٤)، واتە لە هەر (باڕ)ێکدا (٣) زرمەی (نوار) هەیە، لێرەشدا خاڵێ گرنگ ڕیتمی نموونەکەیە کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

(ڤێ ١)

| دوم تەک تەک | دوم تەک تەک |
| --- | --- |
| بەهێز بێ هێز بێ هێز | بەهێز بێ هێز بێ هێز |

ئێستا ئەگەر (باڕ)ێک لە نموونە (جیم ١) وەربگرین و لەگەڵ بڕگەکانی دێڕی یەکەمی (زێ سین)دا ئاوێتەی بکەین، ئەم پێکهاتنەی خوارەوەمان دەست دەکەوێت:

(جیم ٢)

دوم تە تەک دوم تەک

(وەستان) زەم بیل ف رووش

نموونەکە لە (٥) زرمەی (کرۆش) لە (باڕ)ێکدا پێکهاتووە، گۆڕانییەکەش، وەکو (سۆن) بڕیاری دابوو، لە زرمەی سێیەمدا دەست پێدەکات، ئەمەش لە شیعرەکەدا دەکاتە هەنگاوێکی (٤) بڕگەیی کە لە یەکەمین (باڕ)ی (زێ واو)دا بەڕوونی دیارە.

وەرگرتنی (باڕ)ێک لە (ڤێ ١) بڕگە بەندییەکی جیاوازمان لە هەمان دێڕی شیعرەکەدا پیشان دەدات:

(ڤێ ٢)

دوم تەک تەک

(وەستان) زەم بیل

لێرەدا (باڕ)ێکی (٣) زرمەیی، واتە هەنگاوێکی (٢) بڕگەیی لە شیعرەکەدا دروست دەبێت.

جیاوازی لە ژمارەی بڕگەی (باڕ)ەکانی هەردوو نموونەکەدا، ئەوەندە



کار لە جۆری زرمەکانیان ناکات، ئەوەی کاریگەرە ڕادەی کارتێکردنی جۆری زرمەکان لە پلەی بڕگەکانە.

لە نموونە (جیم ٢)دا، تەنیا بڕگەی سێیەم: (ف) سترێسدارە، لەبەر ئەوەی زرمەکەی بەرامبەری زرمەیەکی بەهێزە: (دوم). بەڵام هەمان بڕگە لە (باڕ)ی یەکەمی (واوزێ)دا، کورت و بێ سترێسە: (نوارێکی بێ هێز).

کەچی بەرانبەر بەوە، هەردوو بڕگەی (بیل، رووش)، درێژ و سترێسدارن:

(نوار)ێکی بەهێز و (پنت) ێک.

لەسەرێکی دیکەوە، دوا بڕگەی دێڕی یەکەمی (زێ سین): (لە)، بۆ (باڕ)ێک دەپەڕێتەوە سەر بەدێڕی دووەمی شیعرەکەیە.

لە نموونە (ڤێ ٢)دا، کە (باڕ)ی یەکەمی تەنیا وشەی (زەمبیل) دەگرێتەوە، هەردوو بڕگەی وشەکە بێ سترێسن. وشەی (فرووش) کە لە نموونەی پێشوودا لە هەمان (باڕ)دا بوو، لێرەدا بەهۆی نیشانی کێشی مۆسیقاوە، لە (باڕ)ی دووەمدایە.

هەرچۆنێک بێت، بڕگەی یەکەمی وشەکە: (ف) وەکو نموونە (جیم ٢) دیسانەوە سترێسدارە، بڕگەی دووەمیش: (رووش) بێ سترێسە.

بەڵام لە نموونە (زێ جیم)دا، هێز لەسەر بڕگەی (ف) لا دەچێت و دەکەوێتە سەر بڕگەی دووەمی (فرووش) کە لە دوو (کرۆش) پێکهاتووە، جگە لە چەند جیاوازییەکی دیکە، کە خوێنەر دەتوانێت لە نموونەکاندا تێبینیان بکات.

کەواتە، چ لەنێوان نموونە ڕیتمییەکان و دەقە ئاوازەییەکانداو چ لەنێوان خودی ئەو دەقانەدا، جیاوازییەکی ڕیتمیی سەرەکی دەردەکەوێت کە بەئاشکرا لە بنیاتی ڕیتمی شیعرەکەشدا ڕەنگ دەداتەوە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ خاڵێکی یەکجار گرنگ بکەین، لەوەی

لایەنێکی گەورەی ئەو جیاوازییەی نێوان نموونەکان و شیعرەکە، بۆ بنیاتی سەرەوەی (بەیت)ەکە دەگەڕێتەوە. واتە کاتێک پێویستییەکانی کێشی مۆسیقا، شێوەی وتنی (بەیت)ەکە وەکو گۆڕانییەک دیاری دەکات. بەڵام لە سەرێکی دیکەوە، دەبێ بنیاتی سەربەخۆی ڕیتمی شیعرەکەش ڕەچاو بکرێت کە نموونەکەی (سۆن) لەبەر سێبەری ئاوازەکەدا ڕایگرتووە.

کەواتە جیاوازی لە بنیاتی سەرەوەدا، نابێ هەوڵەکانمان لە ئاستی بنیاتی ژێرەوەدا، کەلە هەموو بابەتێکدا نوێنەری یاسایەکی جێگیرە، تووشی ئاڵۆزی بکات.

یەکەمین تێبینی لەو بارەیەوە، پیشانی دەدات لە هەردوو نموونە ڕیتمییەکەی (جیم، ڤێ)دا، لە هەر (بار)ێکدا لە پاش زرمەی بەهێزی یەکەم: (دوم)، دوو زرمەی بێ هێز هەیە. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت لەنێوان هەردوو زرمەی بەهێزدا، زرمەیەک، یان دوو زرمەی بێ هێز هەیە.

ئەو دیاردە ڕیتمییە بوارمان دەدات بەئاسانی لە ڕێگای دانانی هەر جووتبڕگەیەکی کورت بەبڕگەیەکی کورتی نێوان دوو بڕگەی درێژ، ئەم فۆرمۆلە ڕیتیمییەی خوارەوە دارێژین:

(جیم ٣)

| دوم بەهێز | تە تەک بێ هێز | دوم بەهێز | تەک بێ هێز | دوم بەهێز | تە تەک بێ هێز | دوم بەهێز | تەک... هتد بێ هێز |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

(ڤێ ٣)

| دوم بەهێز | تەکتەک بێ هێز | دوم بەهێز | تەکتەک بێ هێز | دوم بەهێز | تە تەک بێ هێز | ... هتد |
|---|---|---|---|---|---|---|

ئێستا پرسیارێکی گرنگ بێ دواخستن خۆی دەسەپێنێت: ئەو سیستێمە ڕیتمییەی نموونەکانی (جیم ٣، ڤێ ٣) پێشکەش بەشیکردنەوەی شیعری (بەیت)ە کەی دەکەن، چۆن لە شیعرەکەدا- نەک وەکو گۆڕانییەک ڕەنگ دەداتەوە؟



لە ڕاستیدا، وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە لە سنووری شیعری (بەیت)ەکەدا ناوەستێت، بەڵکو ئەو دوای جۆرەکانی شیعری کێشراوی (٧، ٨، ١٠) بڕگەییش دەگرێتەوە؛ چونکە نموونە (زێ سین)، هەرچەندە نیوە دێڕی سێیەمی (١) بڕگە و نیوە دێڕی چوارەمی (٢) بڕگە لە نیوە دێڕی یەکەم و دووەم کەمترن: (٩) بڕگە، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بەشیعرێکی کێشراوی دابنێین[٢٤].

کەواتە وەڵامی پرسیارەکە، بۆ شیکردنەوەکانی کەرتی داهاتوو هەڵدەگرین، کە بۆ دەسنیشانکردنی سیستێمی ڕیتمی شیعری گۆرانی تەرخان کراوە. بەڵام لە پێش ئەوەدا، پێویستە دوا سەرنج ئاراستەی بۆچوونەکانی (سۆن) بکەین.

لە پێشدا وتمان، (سۆن) ئاماژە بۆ نارێکیی ڕیز بەستنی بڕگەکانی (بەیت) ەکە دەکات. ئەو، هەر لەو جێگایەدا لەگەڵ ڕێکیی بڕگە کورت و درێژەکانی کێشی (عەرووز)دا بەراوردی کردوون. بەڵام لە دواییدا بڕیار دەدات نیوە دێڕەکان لە چوارچێوەی ئاوازەکەدا، ئەم داڕشتنەی خوارەوەیان هەیە:

(زێ سین ١) «ب- ب- ب- ب- ب»[٢٥].

دابڕینی شیعری (بەیت)ەکە، لە ڕەگەزی ڕێکی و بەستنەوەی ئەو ڕەگەزە بەئاوازەوە، کە لە ڕاستیدا ڕووتکردنەوەیەتی لە کێش و ڕیتمی سەربەخۆی، تێڕوانینێکە هیچ ئاماژەیەک بۆ وردبینی ناکات.

بە پێچەوانەوە، هەر ئەو ڕەفتارە مۆسیقاییە، قەوارەی شیعرەکە زەوت دەکات و لە خانەی شیعرە چەندییەکاندا پۆلینی دەکات.

نموونە (زێ سین ١) ئەو بۆچوونە بەڕوونی دەسەلمێنێت. نموونەکە، کە وێنەیەکی ڕێکخراوی (زێ سین)ە، ناتوانێت دۆخێکی گشتی بنوێنێت، لە ڕاستیشدا پینە و پەڕۆکانی (زیحاف) و (عیللە)ی (عەرووز)مان بیر دەخاتەوە. دەتوانین بەکۆکردنەوەی هەر (٤) بڕگە لە هەنگاوێکدا،

یەکێک لە کێشە عەرووزییەکانی (هەزەجی مەقبووز)، یان (ڕەجەزی مەخبوون)ی لێ پێک بێنین:

(مەفاعیلون) (مەفاعیلون)= (ب– ب–) (ب– ب–)

ڕەنگە (سۆن) شتێکی وای مەبەست نەبووبێت، هەرچەن بۆچوونەکەی ئەو ئەنجامە دەبەخشێت، بەڵام گومانی تێدانییە نموونە (زێ سین ١) لە کارتێکردنی سیستێمی شیعری ئینگلیزی دوور نییە، بەتایبەتی لە بواری برگە گۆڕینەکاندا ئاماژە بۆ دۆخێکی لێکچووی شیعری ئەوروپاییش دەکات.

نموونەکەی (سۆن) بەئاسانی کێشی (ئەیامب)ی ئینگلیزیی لێ دروست دەبێت:

(زێ سین ٢)

| سترێس بەهێز ´ | سترێس بێ هێز ⌣ | سترێس بەهێز ´ | سترێس بێ هێز ⌣ | سترێس بەهێز ´ | سترێس بێ هێز ⌣ |
|---|---|---|---|---|---|

بەو شێوەیە، بەرامبەر بەدەستکاریکردنی بنیاتی برگەیی دێڕە شیعرەکانی (بەیت)ەکە و سەپاندنی سیستێمێکی قاڵبی بەسەریاندا، پێوەندیی بەهێزی و بێ هێزیی برگەکان، گرنگترین ئەنجامی شیکردنەوەکانی (سۆن) لە بواری شیکردنەوەی سیستێمی ڕیتم لە جۆرێکی کێشراوی شیعری فۆلکلۆریدا پێک دەهێنێت.

لە کەرتی داهاتوودا، هەوڵ دەدەین بزانین چۆن ئەو ئەنجامە گرنگە، بێ دەستکاریکردنی کورتی و درێژیی برگەکان، دەتوانن سیستێمی ڕیتم لە جۆری دووەمی شیعری کێشراوی فۆلکلۆری کوردیدا: (شیعری گۆرانی)، دەسنیشان بکەن[٢٦].

٣– ٣–٢ شیعری گۆرانی: لە دۆخێکدا نموونەیەکی جێگیری (قاڵبی) شک نابەین کۆمەڵە دەنگییەکانی شیعری گۆرانیی کوردییان لەسەر



شیبکەینەوە، بەگوێرەی ئەوەش جێگای دیاریکراوی سترێسی شیعریان تێدا دەستنیشان بکەین، ناچارین لە کۆمەڵە گەورەکانەوە: (دێڕو نیوەدێڕ)، دەست پێبکەین.

سەرەتا نموونەیەک لە شیعرێکی دە برگەیی فۆلکلۆری وەردەگرین و هەوڵ دەدەین مەشقی ئەو ڕەوتە ئاوەژووەی پێبکەین:

(فێ میم)

ئەگەر نەبوایە بەلۆمەی وڵات
کەپرێکم ئەبەست شەو و ڕۆژ لەلات[٢٧]

هەڵبژاردنی نموونەکە، پابەندی پێوەرێکی دیاریکراو نییە. شیعری گۆرانی بەگشتی زۆر سادەیە و هیچ مەیلێک بەلای ملکەچکردنی زمانی ڕۆژانە بۆ مەبەستی ئاڵۆزی شیعر پیشان نادات. بەگوێرەی ئەو ئەژمارەی بۆ (٤٣٧) گۆرانییەکەی ناو کتێبەکەی (د. موکری) کردوومانە، نزیکەی (٩٥٪)ی گۆرانییەکان هەمان بناغەی سادەترین ڕستەی کوردییان هەیە کە (د. وریا عمر أمین) لەم نەخشەیەی خوارەوەدا دەسنیشانی کردووە[٢٨]:




بەڵام بەرامبەر بەو جووتبوونە سینتاکسییەی نێوان زمانی شیعر و زمانی ڕۆژانە، لە گەلێ شیعردا هەڵچوونی تیژ و وێنەی لە ڕادەبەدەر،

ئەو دوو شێوەیەی زمان لە یەکتر دادەبڕن. ئەو درکە نهێنییەی لە وێنەیەکی شیعریی وەکو (ئاە هەناسەکەم کێو لەبن دێنێ)دا گەڵاڵە کراوە، هێزێک بە(هەناسە) دەبەخشێت لە زەینی گوێگر، یان خوێنەردا، گەلێ لە قوڵنگەکەی (فەرهاد) سەرنجڕاکێشتر و کاریگەرتریشە.

هەر چۆنێک بێت، با بگەڕێینەوە لای نموونە (فێ میم) و سەرنجێکی سینتاکسی ئاراستەی بنیاتەکەی بکەین.

نموونەکە، بەگشتی، لە ڕستەیەکی تێکەڵ پێکهاتووە. بەگوێرەی پۆلینکردنی (د. کوردستان موکریانی)، لە جۆری ڕستەی شوێنکەوتووی مەرجە. ئەو جۆرە ڕستەیە پێکهاتنێکی وەکو ئەمەی خوارەوەی هەیە:

«١» ئەگەر نەبوایە بەلۆمەی وڵات «٢» کەپرێکم ئەبەست شەو و ڕۆژ لەلات

(ڕستەی شوێنکەوتووی مەرج) (ڕستەی سەرەکی)

بە گوێرەی پێناسەکەی (د. کوردستان)، ڕستەی شوێنکەوتووی مەرج «مەرجی ڕوودان و دیاردەی ڕستەی سەرەکی ئاشکرا دەکات»[٢٩].

دەتوانین لەو بۆچوونەوە، ڕستەی «١» بەکرداری مەرج و ڕستەی «٢» بەوەڵامی ئەو مەرجە دابنێین. ئەم پۆلینکردنە بایەخێکی گەلێ گرنگی بۆ پیشاندانی بنیاتی ئاوازەیی نیوە دێڕەکان هەیە.

ڕستەی «١»، بارێکی دەروونیی دوو دڵ پیشان دەدات کە لە دوا ئەنجامدا لە شێوازی (پرسیار) نزیک دەکەوێتەوە.

ڕستەی «٢»ش، کە نیازی ڕەفتاری مەرجداری پەیامدەر دووپات دەکاتەوە، شێوازێکی بڕیاردان دەنوێنێت.

بەو پێیە، ئاوازەی ڕستەی «١» بەوەستانێکی بەرز: / ↖/ و ڕستەی «٢»ش بەوەستانێکی نزم: / ↙/ دواییان پێدەدێت.

دابەشکردنی ئاسایی شیعری (١٠) برگەیی: (٥+٥)، ڕێگا



بەدابەشکردنێکی بچووکتری ئاوازەیی دەدات کە هەمان سیستێمی پێشوو دەپارێزێت.

ئەگەر لە ڕووی واتاوە سەرنجی فرەیزی (ئەگەر نەبوایە) بدەین، دەبینین هەمان شێوازی (پرسیاری) ڕستەی «١»ی هەیە. فرەیزی دووەمیش: (بە لۆمەی وڵات)، کە دەتوانین بەشێوازێکی (وەڵام)یی فرەیزی یەکەمی بژمێرین، هەمان سیستێمی ئاوازەیی ڕستەی «٢» وەردەگرێت. ئەو دۆخە، بۆ ڕستەی «٢» ش دەپەڕێتەوە و هەمان سیستێم بەهەردوو فرەیزی (کەپرێکم ئەبەست)ی ناتەواو و فرەیزی تەواوکەری (شەو و ڕۆژ لەلات) دەبەخشێت.

ئێستا دەتوانین ئاوازەی هەردوو ڕستەی «١» و «٢» بەم شێوەیەی خوارەوە دیاری بکەین:

«١» ئەگەر نەبوایە / ↖/ بەلۆمەی وڵات/ ↙/
«٢» کەپرێکم ئەبەست/ ↖/ شەو و ڕۆژ لەلات / ↙/

بەڵام پرۆسێسی دابەشبوونەکان تەنیا لە سنووری فرەیزەکاندا ناوەستێت.

ئەو تەقینەوە هێشووییە، ئەوەندەی بنیاتی واتایی فرەیزەکان ڕێگا بدات، تا بچووکترین پارچە بەردەوام دەبێت.

وشەی (ئەگەر) شێوازێکی پرسیاریی هەیە، هەر لە سنووری فرەیزەکەی خۆیدا، بەوشەی (نەبوایە) وەڵامێکی کاتیی دەدرێتەوە، ئەمەش لەو دوای فرەیزەکاندا هەروایە.

بەو شێوەیە، لە قۆناغی داڕشتنی سیستێمی ئاوازەیی دێڕە شیعرەکە بەئەندازەیەک نزیک دەبینەوە بتوانین لەم نەخشەی خوارەوەدا دایبڕێژین:

(فێ میم ١)

«١» ئەگەر /↖/ نەبوایە / ↙/ بەلۆمەی /↖/ وڵات/ ↙/
«٢» کەپرێکم / ↖/ ئەبەست / ↙/ شەو و ڕۆژ/ ↖/ لەلات/ ↙/

ئەو بەرامبەرییە لەنێوان پلەی جیاوازی ئاوازەی پەیژە دەنگییەکاندا، بواری دەسنیشانکردنێکی دروستی کۆمەڵە دەنگییەکان و جێگای (وەستان)ی نێوانیان دەدات" لە بەشەکانی خوارەوەدا هەوڵ دەدەین ڕووناکییەکی پتر ئاراستەی ئەو خاڵە گرنگە بکەین.

(ئەلف): ئەگەر لە نموونە (فێ میم ١) ورد بینەوە، یەکسەر تێبینی نیشانەی ئاوازەکان دەکەین کە بەڕوونی سنووری یەکە دەنگییەکانی شیعرەکەیان جیا کردۆتەوە و لە هەمان کاتدا سنووری یەکە سیمانتیە سەربەخۆکانن.

ئەو دیاردەیە، سەرەڕای پاراستنی قەوارەی وشەکان، سەرەکیترین جیاوازی لەنێوان کێشی خۆماڵی و ئەو دوای کێشە قاڵبیەکاندا دەردەخات.

کێش لە شیعری خۆماڵیدا زیان بەبنیاتی سەربەخۆی وشەکان ناگەیەنێت، ئەمەش یەکێکە لە ئەدگارە سەرەکییەکانی کێشی خۆماڵی و دەبێتە هۆی ئەوەی هەردوو وەستانی شیعری و سیمانتی تیایدا هاوجێگابن.

جیاکردنەوەی کۆمەڵە دەنگییەکانی شیعرەکە، وەکو نموونە (فێ میم ١) پیشانی دەدات، بنچینەیەکی پتەوی لە بنیاتی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردیدا هەیە.

ئەم خشتەیەی خوارەوە، ئەنجامی ئەژمارەیی (بنیاتی بڕگەیی) بەرگی یەکەمی (فەرهەنگی خاڵ)ە،کە لە نزیکەی (٧٣٢٤) وشە پێکهاتووە:

| وشەکان | (١) بڕگەیی | (٢) بڕگەیی | (٣) بڕگەیی | (٤) بڕگەیی | (٥) بڕگەیی | (٦) بڕگەیی |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| ڕێژەی سەدییان | ٥,٨ ٪ | ٤٠ ٪ | ٣٤,٢٨ ٪ | ١٤,٨٢ ٪ | ٣,٩١ ٪ | ٠,٩٩ ٪ |

خشتەی (٣-٤)
ڕێژەی سەدیی بنیاتی بڕگەییی وشەکانی بەرگی یەکەمی (فەرهەنگی خاڵ)



خشتەکە بەڕوونی ڕێژەی باڵای وشە (٢، ٣) بڕگەییەکان لە بنیاتی مۆرفۆلۆژیی زمانی کوردیدا، لە ئاست ئەو دوای وشە (٤، ١، ٥، ٦) بڕگەییەکاندا دەردەخات. ڕاستیی ئەو ئەنجامە لە بواری شیعری گۆرانیدا، لەو شیتەڵکردنەوانەدا دەردەکەوێت بۆ کۆمەڵە شیعرێکی گۆرانیی هەمە کێشی دوو توێی چەند سەرچاوەیەکی فۆلکلۆری ئەنجامان داوە[٣٠].

ئەنجامی تاقیکردنەوەکان دەیسەلمێنێت شیعری گۆرانیی کوردی، نزیکەی (٩٣٪) کۆمەڵە دەنگییەکانی لە یەکەی (٢، ٣) بڕگەیی پێکدێن.

گرنگیی ئەو ئەنجامە لە بواری بنیاتی مۆرفۆلۆژیی شیعری گۆرانیدا، کاتێک ئاشکرا دەبێت ئەگەر بزانین یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەو بنیاتە، لەوەدایە وەکو (مەکارۆس) بۆی دەچێت «هەموو وشەیێک لە ئاخاوتنێکی دراودا هێزی فەرهەنگی (ئاسایی) خۆی هەیە»[٣١].

بە نموونە، لە دوو وشەی وەکوو (مناڵ، هەژار)دا، کە هەر یەکەیان وەکو کۆمەڵەیەکی دەنگی ستریسی ئاسایی خۆی هەیە، ئەگەر هەردووکیان لە کۆمەڵە دەنگییەکی وەکو (مناڵی هەژار)دا کۆبکەینەوە، هەر یەکێک لە کۆمەڵە دەنگییەکانی پێشوو ستریسی تایبەتیی خۆی دەپارێزێت.

ئەو دیاردەیە لە زمانی ئینگلیزیشدا، کە ستریس تیایدا فۆنیمە و وەکو ستریس کوردی، بنیاتی سیمانتی دەگۆڕێت، هەر وایە. بەڵام زمانێکی وەکو (فەرەنسی) کە ستریسی تیایدا دیاردەیەکی سستە، لە دۆخێکی چەشنی ئەوەی پێشوودا، ستریسی هەموو وشەکانی کۆمەڵە تازەکە، دوا بڕگەی وشەی کۆتایی کۆمەڵەکە وەری دەگرێت.

بەو شێوەیە، دێڕە شیعرێکی گۆرانیی کوردی، ئەوەندەی ئەو کۆمەڵە دەنگییانەی لێیان پێکدێت، ستریسی ئاسایی هەڵدەگرێت.

سنووری نێوان ئەو کۆمەڵە دەنگییانە، بەزنجیرە دابڕێکی ئاوازەیی لە

یەکتر جیادەبنەوە و بەگوێرەی پلەکانیان چەند مەڵبەندێکی ڕیتمی ناوخۆیی لە دێڕە شیعرەکەدا پێک دەهێنن کە دابەشکردنە ئاساییەکانی کێشی خۆماڵی: (٥+٥، لە نموونەکەی پێشوودا)، دەیانشارنەوە.

ئێستا، تەنیا هەنگاوێک لە دارشتنی سیستێمی سترێسبەندیی نموونە (فێ میم) جیامان دەکاتەوە، ئەویش گۆڕینەوەی نیشانە ئاوازەییەکانە بەپلەکانی سترێسی وشە.

واله خوارەوەدا، دوو یاسای گشتی لە بارەی جۆری ئەو سترێسەی لەگەڵ هەر یەکێک لە هێڵە ئاوازەییە بەرزەکان، یان نزمەکاندا ڕێک دەکەون، تۆمار دەکەین:

(هێ ١) /↙/ ڕستەی ئەم هێڵە بەئاوازەیەکی ئاسایی دەست پێدەکات و بەردەوام دەبێت. بەڵام لە پێش کۆتاییدا ئاوازەکە بەرە و پلەی بەرز سەردەکەوێت و پاشان لە کۆتایی ڕستەکەدا دادەبەزێت.

(هێ ٢) /↖/ ڕستەی ئەم هێڵە بەئاوازەیەکی ئاسایی دەست پێدەکات و پاشان بەرەو پلەی بەرز سەردەکەوێت و تاکۆتاییش بەبەرزی دەمێنێتەوە. ڕستەکان لە هەردوو هێڵەکەدا بەهەمان پلەی ئاواز دواییان پێدێت، واتە ڕستەی هێڵی یەکەم بەوەستانێکی نزم و ڕستەی هێڵی دووەم بەوەستانێکی بەرز دواییان پێدێت[٣٢].

بە ڕەچاوکردنی دەستوورەکانی سەرەوە و دانانی سترێسێکی بەهێز لە جێگای هەر ئاوازەیەکی بەرزدا، نموونە (فێ میم ١) ئەم سیستێمە سترێسییەی خوارەوە وەردەگرێت:

(فێ میم ٢)»

ئەگەَر/ نەبَوایە/ بەلۆمەَی/ وَلات/

کەپرێکَەم/ ئەبَەست/ شەو و ڕَۆژ/ لەلاَت/

ئەوەی لە نموونەکەدا بەئەندازەی یەکەم سەرنج ڕادەکێشێت، نەمانی دابەشکردنە ئاساییەکەی شیعری (١٠) بڕگەییە: (٥+٥). وەکو



دەبینین، نیوە دێڕی یەکەم لەبری دوو (هەنگاو)ی (٥) بڕگەیی، لە (٤) کۆمەڵە دەنگیی (٢/٣/٣/٢) بڕگەیی و نیوە دێڕی دووەمیش لە (٤) کۆمەڵە دەنگیی (٣/٢/٣/٢) بڕگەیی پێکهاتوون.

ئەو سەرنجە لە ئاستی کێش و ڕیتمی نموونەکەدا، چی دەبەخشێت؟

وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە ناچارمان دەکات، چەند تێبینییەک ئاراستەی چەمکی یەکەی ڕیتمی: (هەنگاو) بکەین.

(بێ): سادەترین مەرجی (هەنگاو- التفعلیە- Foot)، هەر لە (ئەریستۆ)وە تا ئەمڕۆش، هاوژمارەیی بڕگەکانە.

ئەو مەرجە، کە تەنیا ئاستی کێشی ڕەچاوکردووە، پاشان بەهۆی پەرەسەندنی لێکۆڵینەوەکانی ڕیتمەوە،چەند مەرجێکی دیکەی پاڵ خرا.

وەکو بینیمان، (ڤایل) مەرجی دەستنیشانکردنی دیاردەیەکی دەنگیی دووپات دەکاتەوە: (١-٣-١). نووسەرێکی وەکو (محمد عیاشی)ش، هەنگاوێک پتر دەڕوات و سێ مەرج بۆ دروستیی هەر بزووتنەوەیەکی ڕیتمی دەسنیشان دەکات، کە بریتییە لە کێش و کات و سیستێمی ڕیزبوونی بڕگەیی[٣٣].

(کەمال ئەبودیب) دوو مەرج بۆ هاوسەنگیی یەکە ڕیتمییەکان دیاری دەکات: یەکەمیان ئەوەیە ژمارەی ڤاوڵەکانیان (یان بڕگەکانیان)، ئەوەندەی یەکتر بێت، دووەمیشیان ئەوەیە ڕیز بەستنی ناوکە ڕیتمییەکان لە هەردووکیاندا، یەک شێوەی ئاسۆیی هەبێت[٣٤].

وەکو دەبینین، مەرجی هاوکێشیی یەکەکان، لە هەرسێ بۆچوونەکەدا هاوبەشە، دوای ئەویش جۆری ڕیزبوونی بڕگەکان لە (٢) یەکەدا مەرجی دووەمە.

ئێستا ئەگەر سەرنجێکی دیکەی نموونە (فێ میم ٢) بدەینەوە، دەبینین مەرجی یەکەمی (یەکە)ی ڕیتمی، واتە هاوژمارەیی، لە هەموو کۆمەڵە دەنگییەکاندا ئەوەندەی یەک نییە. سیستێمی سترێسەکانیش، ڕوودانێکی ڕێکی لە هەمان جێگای کۆمەڵەکاندا، بەرچاو ناکەوێت.

کەواتە، نە لە ئاستی کێشدا و نە لە ئاستی ڕیتمیشدا، سیستێمێکی ڕەچاوکراو نابینرێت. ئەمەش بەو ئەنجامە گرنگەمان دەگەیەنێت کە (دڵشاد عەلی) سەرنجێکی وردی ئاراستە کردووە و بەپەلە لێی پاشگەزبۆتەوە.

(دڵشاد) لە هەوڵدانێکدا بۆ پێناسەکردن و دەسنیشانکردنی سروشتی (پێ) لە (کێشی بڕگەیی)دا، دووپاتی دەکاتەوە بەکارهێنانی دەستە (پێ)ی جیاواز لە شیعرێکدا: (١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦) و ڕەچاوکردنی ژمارەی بڕگە لە دێڕەکاندا نەک لە (پێ) یەکاندا «ڕەنگە بنە مایەی ئەو بۆچوونەی کە پێی هۆنراوە لە کێشی بڕگەیی دا بۆ خۆی هیچ دەورێکی نامێنی»[٣٥].

گومانی تێدا نییە ئەو بۆچوونە، لەگەڵ ئەو سیما لاوازەشدا کە لێی پێچراوە: «ڕەنگە (...) دەورێکی»، سەرەکیترین مەرجەکانی (هەنگاو)ی ڕەچاوکردووە. بەڵام دەسەڵاتی زاڵی پۆلینکردنی باوی کێشی خۆماڵی بەسەر (دڵشاد)دا، وای لێ کردووە وەکو «دانەی فۆنەتیکی» لە بڕگەی کوردی بڕوانێت و یەکسەر بڕیار بداتەوە: «دیاریکردنی پێی هۆنراوە لە ناو دێڕ و بەیتی هەڵبەستێکدا گرنگیی خۆی هەر دەمێنێ»[٣٦].

جیاوازی نێوان کێشی خۆماڵی و کێشی (چەندی) و (چۆنی)، لەوەدا نییە لە کێشی (چەندی)دا کورتی و درێژیی بڕگە و لە کێشی (چۆنی)دا سووکی و قورسیی بڕگەکان ڕەچاو دەکرێن و لە کێشی خۆماڵیدا ئەو دیاردانە ڕوونادەن، یان بەگوێرەی زاراوە بەکارهێنراوەکانی (دڵشاد)، کێشی خۆماڵی وەکو «دانەیەکی فۆنەتیکی» بڕگە بەکاردەهێنێت و دوو کێشەکەی دیکە وەکو «دانەیەکی فۆنۆلۆژی» سوودی لێ وەردەگرن[٣٧].

جیاوازیی نێوان کێشی خۆماڵی و ئەو دوو کێشە لەوەدایە ئەوان بەگوێرەی سیستێمێکی (قاڵبی)ی لە پێشدا داڕێژراو بڕگەکان لە چەند (هەنگاو)ێکدا ڕیزدەکەن، لەبەر ئەوە هەست بەدووبارە بوونەوەیەکی



ڕێکی بڕگە کورت و درێژەکان لە کێشی (چەندی)دا و بڕگە بەهێز و بێ هێزەکان لە کێشی (چۆنی)دا دەکرێت.

بەڵام لە کێشی خۆماڵیدا، کە ئەو دووبارەکردنەوە ڕێگەی بڕگە کورت و درێژەکان، یان سترێسدار و بێ سترێسەکان ڕوونادات- تکایە سەرنج بدرێت، بەهۆی نەبوونی (هەنگاو- پێ) وە- سیستێمێکی ڕیتمیی جیاواز دروست دەبێت.

بەهێزترین بەڵگەی تیۆری بۆ ئەم بۆچوونە ئەوەیە، لە هەر جێگایەکدا هەوڵ درابێت بڕگەکانی کێشی خۆماڵی لە چەند دەستەیەکی هاوژمارەدا کۆبکرێنەوە، بەدەستکارییەکی کەمەوە لە (تەفعیلە)ی عەرووزی، یان (Foot)ی ئینگلیزی نزیک بوونەتەوە. (بڕوانە: نموونەکەی سۆن، ٣-٣-١، زێ سین ١- زێ سین ٢).

لە پراکتیکیشدا، دەتوانین سەرنجی ئەم دوو دێڕەی (گۆران) کە لە بەراووردکردنە عەزووزییەکەشدا مەیلی خۆی بۆ ئەو سیستێمە دەربڕیبوو. لە ڕوانگەی کێشێکی ئینگلیزییەوە، بدەین:

(تێ گاف)

| منَ ژْ | َیانْم | گیَانْم | هەَستیم |
| --- | --- | --- | --- |
| هیَواْم | تَاسەْم | شَادیْم | مەَستیم |
| بیَرْم | هۆَشْم | هەَرچیْم | هەَیەْ |
| بەَ هرەْی | جیَلوەْی | ئەَوزوْهـ | رەَیەْ |

وەکو دەبینین، دوو دێڕەکەی (گۆران) کە لە بنەڕەتدا بەکێشی خۆماڵی هۆنراونەتەوە، بەدەستکارییەکی کەمەوە: (لەتکردنی فرەیزی- من ژیانم، ئەو زوهرەیە)، دەبێت بەشیعرێکی (ترووکی)ی ئینگلیزی کە لە دووبارە بوونەوەی (هەنگاو)ێکی دوو بڕگەیی دروست دەبێت، بڕگەی یەکەمیان بەهێز و دووەمیشیان بێ هیزە.

بەوەش، ئاشنای ئەدگارێکی دیکەی کێشی خۆماڵی دەبین کە بریتییە

لە بایەخ نەدان بەکۆکردنەوەی ژمارەیەک بڕگە لە (یەکە)ی هاوسەنگدا.

ئێستا دەتوانین ئەدگارەکانی هەر یەک لە (کێش) و (ڕیتم) لە شیعری گۆرانیی فۆلکلۆریدا «کە شیعرە کێشراوەکانی (بەیت) یش دەگرێتەوە» لەم خشتەیەی خوارەوەدا، دابڕێژین:

| یەکەی کێش | بچووک | گەورە | ئاستی چەندی | ئاستی چۆنی | ڕیزکردن |
|---|---|---|---|---|---|
| | بڕگە | نیوە دێڕ | + | + | نارێک |
| یەکەی ڕیتم | بچووک | گەورە | چەندێتی | چۆنێتی | دووبارەکردنەوە |
| | بڕگەی سترێسدار | مۆرفیمی واتادار | ناهاوسەنگ | تاک زرمە | جیاواز |

خشتەی (٣-٥)
یەکەکانی (کێش) و (ڕیتم) لە شیعری گۆرانیدا

٣-٤ داڕشتنەوەی نموونەکان:

لەم کەرتەدا هەوڵ دەدەین، وەکو مەشقێکی ئەزموونگەری، هەموو ئەو نموونانەی لە فەسڵەکانی پێشوودا بەراووردکران و هەڵسەنگێندران، بەگوێرەی دەستکەوتەکانی کەرتی (٣-٣)ی ئەم فەسڵە سەرلەنوێ داڕێژینەوە.

٣-٤-١ نەمەجنوونم نە فەرهادم// زەحمەتکێش و ڕەنج بەبادم (٢-٢-٢، فێ) ئەگەر سەرنجی بنیاتی سینتاکسیی نیوە دێڕەکان بدەین، دەبینین هەر نیوە دێڕێک لە ڕستەیەکی تەواو پێکهاتووە. بەدەربڕینێکی دیکە، هەر یەکێک لە نیوە دێڕەکان شێوازێکی ڕاپۆرتیی هەیە کە لە نیوەدێڕی یەکەمدا (نەرێ) و لە نیوە دێڕی دووەمدا (ئەرێ)یە.

بەو شێوەیە، کۆمەڵە دەنگییەکانی هەر نیوە دێڕێک، هێڵێکی ئاوازەیی نزمیان دەبێت کە دەتوانین لەم شێوەیەی خوارەوەدا دایانڕێژین:

نە مجنوونم/↙/ نە فەرهادم/↙/ زەحمەتکێش و/↙/ ڕەنج بەبادم/↙/



ئێستا ئەگەر هەر کۆمەڵە دەنگییەک بەڕستەیەکی سەربەخۆ دابنێین، دەبینین بەگوێرەی دەستووری (هێ-١) هەر ڕستەیەک بەئاوازەیەکی ئاسایی دەست پێدەکات و پێش تەواوبوونی ڕستەکە پلەی ئاوازەکەی بەرز دەبێتەوە، ئەمجا لەگەڵ تەواوبوونیدا بەرەو نزمی دەڕوات.

بەگۆڕینەوەی پلە ئاوازەییەکان بەگوێرەی دەستووری (هێ- ٢) لەگەڵ پلەکانی سترێسدا، ئەم داڕشتنەی خوارەوەمان دەستگیر دەبێت:

نە مەجنوَونم نە فەرهَادم// زەحمەتکێَش و ڕەنج بەبَادم

بەڵام هەر خوێندنەوەیەکی ڕیتمیی دێڕە شیعرەکە بەگوێرەی واتای نیوە دێڕەکانی، هەست بەژمارەیەکی مەڵبەندی ڕیتمی پتر لەوەی داڕشتنەکەی پێشوو دەریخستووە، ئاشنا دەکات.

لە نیوە دێڕی یەکەمدا، هەر یەکێک لە ئامرازەکانی (نەرێ- نە) بەگوێرەی ئەو قورسایییە سیمانتییەی کەوتۆتە سەریان، هەڵگری سترێسێکی بەهێزن. لەبەر ئەوە هەر یەکێکیان- وەکو مەڵبەندێکی ڕیتمی- لە کۆمەڵە دەنگییەکانیان دەبنەوە.

کۆمەڵە دەنگییەکانی نیوە دێڕی دووەم، هەر یەکێکیان لە وشەیەکی لێکدراو پێکهاتووە کە وشە بنەچەییەکانیان وەکو پێشتر بینیمان لە زمانی کوردیدا سترێسی فەرهەنگیی خۆیان دەپارێزن.

کەواتە دەتوانین دێڕە شیعرەکە لەم شێوە ئاوازەییەی خوارەوەدا داڕێژین:

نە/↙/ مەجنوونم/↙/ نە/↙/ فەرهادم/↙/ زەحمەت/↙/ کێش و/↙/ ڕەنج/↙/ بەبادم/↙/

سیستێمی سترێسبەندییەکەشی ئەم فۆرمەی خوارەوەی دەبێت:

نەَ مەجنوَونم نەَ فەرهَادم// زەَحمەتکێَش و ڕەَنج بەبَادم[٣٩].

ئەو درێژییەی بەشیتەڵکردنەوەی نموونە (٣- ٤-١) مان دا، بەو مەبەستەیە لە داڕشتنی نموونەکانی دیکەدا، کە لە خاڵە سەرەکییەکاندا

هاوبەشی نموونەکەن، تەنیا هێڵە ئاوازەییەکان و سیستێمی سترێسبەندییان دەسنیشان بکەین.

٣- ٤-٢ ماڵی ویران کردم چاوی// دێوانەم بۆ زولفی خاوی (٢-٢-٢ ، فێ جیم) هێڵە ئاوازەییەکان ئەم شێوەیەی خوارەوەیان هەیە:

ماڵی/↙/ ویران/↖/ کردم/↙/ چاوی/↙/ دێوانەم/↖/ بۆ زولفی /↙/ خاوی/↙/

سیستێمی سترێسبەندییەکەشی وەکو شێوەی خوارەوە دەبێت:

مَاڵی وێرَان کرَدم چَاوی// دَێوانەَم بۆ زَوڵفی خَاوی

٣-٤-٣ کەس نازانێ بۆ بێ ڕەنگم// گیرۆدەی دەستی فەڕەنگم (٢-١-٣، فێ نوون) هێڵە ئاوازەییەکان:

کەس/↖/ نازانێ/↙/ بۆ /↖/ بێ ڕەنگم/↙/ گیرۆدەی/↖/ دەستی /↙/ فەڕەنگم/↙/

سیستێمی سترێسبەندی:

کەَس نَازانێ َبۆ بێ ڕَەنگم// گیَرۆدەی دەَستی فەڕَەنگم

٣- ٤ -٤ چون دێوانەی شۆر ئازیز نەسەردا

شەتاو سەرهۆرگرت وە دەشت ودەردا(٢- ٣- ٢ ، گاف میم)

هێڵە ئاوازەییەکان:

چون دێوانەی /↖/ شۆر/↖/ ئازیز/↖/ نەسەردا/↙/

شەتاو/↖/ سەرهۆرگرت/↙/ وەدەشت و /↙/ دەردا/↙/

سیستێمی سترێسبەندی:

چون دَێوانەی شَور ئازیَز نە سەَردا

شەتَاو سەرهَۆرگرت وەدَەشت ودَەردا



٣- ٤- ٥ ئەڕۆیشتم بەئەسپایی کش و مات

لاشە سست و دڵ کەیلی تاسەو ئاوات (٢- ٤- ٣، بێ)

هێڵە ئاوازەییەکان:

ئەڕۆیشتم/↙/ بەئەسپایی/↙/ کش و /↙/ مات/↙/

لاشە/↙/ سست و/↙/ دڵ کەیلی/↙/ تاسەو ئاوات/↙/

سیستێمی سترێسبەندی:

ئەڕۆیَشتم بەئەسپَایی کَش و مَات

لاشە سَست و دڵ کَەیلی تاسەَو ئاوَات

٣-٤-٦ بەفرمێسکی پەشیمانی// ئەی زوهرەی ناز زوهرەی جوانی (٢- ٤- ٣، گاف ژی)

هێڵە ئاوازەییەکان:

بە/↖/ فرمێسکی/↙/ پەشیمانی/↙/ ئەی/↖/ زوهرەی ناز/↙/ زوهرەی جوانی/↙/

سیستێمی ستریسبەندی:

بَە فرمێسکی پەشیمانی// ئەی زوهرەی ناز زوهرەی جوانی

٣- ٤- ٧ تۆبی زەردەخەنەی چاوت// لێوی بەعاستەم توراوت

(٢- ٤- ٣، گاف میم)

هێڵە ئاوازەییەکان:

تۆبی/↙/ زەردەخەنەی/↙/ چاوت/↙/ لێوی/↙/ بەعاستەم/↙/ تۆراوت/↙/

سیستێمی سترێسبەندی:

تَوبی زَەردەخَەنەی چَاوت// لیَوی بەعَاستەَم تۆرَاوت

٣-٤-٨

زەمـــبـــیلفـــرووش لاوکی ڕوڤـــالە
بە کـــــفــــێلت و ئەهل و ئـەیالە
حـــــــوسنیــــــا یووسف لە بالـە
دەس لە کــــورسی ســـەنعــــەتی

(٣- ٣- ١، زێ سین)

هێڵە ئاوازەییەکان:

زەمـبـیل/ ↖/ فـرووش/ ↖/ لاوکی/ ↙/ ڕوڤـاڵە/ ↙/
بـە کـــــفـلـێت و /↙/ ئـەهـل و /↙/ ئـەیـالـە/ ↙/
حـــــوسنیـــــا/↖ / یووسف/↖ / لـە بـالـە/ ↙/
دەس ↖/ لە کـــورس/↙/ ســـەنعـــەتێ/ ↙/

سیستێمی سترێسبەندی:

زەمـــبَـــیل فـــروَش لاَوکی ڕۆڤَـــالە
بە کــــــفـلـیَت و ئەهَل و ئـەیَالە
حــــــوَسنیـــــا یـووَسف لـە بَالە
دَەسلە کــــورسیَ ســـــەنعَـــەتی

٣- ٤- ٩ دوا نموونە، کە شیکردنەوەکەی لە دواقۆناغدا ڕاگیرا، نموونە (فێ مـــــــیم، ٢، ٣- ٣- ٢) بـوو، ئـەویـش بـەلابـردنـی سـنـوورە دەستکردەکانی نێوان کۆمەڵە دەنگییەکانی، بەشێوەی نموونەیی دەگات:

ئەگــــەر نەبَوایە بـەلـۆمـــــەیَ وَلاَت
کـەپرێکـَم ئەبەَست شـەو و ڕۆَژ لە لات

٣- ٤- ١٠ سیـستێمی ڕیتم لە شیـعری گـۆرانی کـوردیدا، لەسـەر بنچینەی دووبارەکردنەوەی ژمارەیەکی دیاریکراوی سترێسی بنەچەیی دادەمەزرێت. بەڵام لەبەر نارێکیی دەستە دەنگییەکان، ئەو سترێسە لە



هەمـان جێگای بڕگـەکـاندا دووبارە نابێتـەوە. لێرەشەوەیە سترێس لە شیـعرەکەدا ئازادە و پێوەندییـەکی ڕێکی ڕیتـمی، لەگـەڵ سترێسی بێ هێزدا پێک ناهێنێت.

---

(١) بەکارهێنانی ئەو ئەدگارەی زمانی کوردی، لە شیعری کلاسیدا: (عەرووزی) بەڕوونی دەردەکەوێت.
(٢) علم الاصوات، ص ١٩٤.
(٣) الثقافة الاجنبية، ص ١٩.
(٤) لە نووسراوە کوردییەکاندا لەبری (سترێس)، بەزۆری (هێز) بەکار دەهێنرێت. ڕەنگە ئەمە لە سنووری بەکـارهێنانی زاراوەییـدا کـارێکی بەجێ بێت، بەڵام لە بواری شیعردا، کە زۆر جار پێویست دەکات زاراوەی (هێز) وەکو ئاوەڵناوێک بۆ سروشتی بڕگەکان بەکاربهێنرێت: (بڕگەی بەهێز، بڕگەی بێ هێز- بەنموونە) لە کـاتێکدا هەردوو بڕگـەکە سترێسـدارن، جۆرە ئاڵۆزییەک دروست دەبێت، بەڕای ئێمە بەکارهێنانی زاراوە بنەچەییەکە لەم بوارەدا، لەبارترە.
(٥) قواعد اللغة الكردية، ص٩ .
(٦) ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٥).
(٧) لایەنێکی گرنگی ئەو زانیارییانە، لەم سەرچاوانەی خوارەوەدا دەست دەکەون:
- فۆنەتیکی زمانی کوردی، محەمەد ئەمین هەورامانی، بەغدا، ١٩٧٤.
- سەرەتایەک لە فیلۆلۆژیی زمانی کوردی، محەمەد ئەمین هەورامانی، بەغدا، ١٩٧٤.
- زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراووردا، محەمەد ئەمین هەورامانی، بەغدا، ١٩٨١.
- زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا، بەغدا، ١٩٧٦.
- فۆنەتیک، غازی فاتیح وەیس، بەغدا، ١٩٨٤.
(٨) حاضر الفن، ص١٣.
(٩) مقدمة في الانثروبولوجيا العامة، ص ٧٠٥.
(١٠) جريدة الثورة، العدد ٧٣٠٥.
(١١) جريدة الجمهورية، العدد ٧٥٨٩.
(١٢) الفصول والغايات، ص١٣١.

(١٣) گاتها، ص٦٥.
(١٤) کاروان، ژماره (٧٦).
(١٥) بەیان، ژماره (٥٧)
(١٦) (ئەحمەد حەیران) ئەو ئامرازە ڕیتمییانە بەچەند دیاردەیەکی دەرەکی دادەنێت کە «تێکەڵ بەتێکستە ئەسڵیەکە» کراون و بەلابردنیان «مانای تێکستە ئەسڵیەکە تێک ناچێ». ئەو تێڕوانینە سیمانتیە ڕووتە، ئاستی ڕیتمی دەقەکانی بەشێوەیەکی نارەوا پشتگوێ خستووە، هەر ئەو نموونەیەی کە خۆی لەو ئامرازە ڕیتمییانە دایبڕیوون، بەڕوونی لاوازیی بۆچوونەکەی پیشان دەدات. بڕوانە:
- دیوانی حەیرانبێژان، بەغدا، ١٩٨٨، ل١٤٠-١٤١.
(١٧) لێرەدا بێجێ نییە، کە هەل ڕێکەوتووە، گۆشەیەکی ئەو بۆچوونەی لە فەسلی یەکەمدا: (١-٥-١، بێ) لە بواری چەمکی (کێش) و (ڕیتم)دا پەرەمان پێدا و لەبەر پێویستیی بەلێکۆڵینەوەی پتر بڕیارمان دا لەم نامەیەدا پێڕەوییان لێ نەکەین، تاقیکەینەوە. دەتوانین بزووتنەوەی یەکەمی دەقەکە لە ڕیتمی دەنگیدا، بە(کێش) دابنێین: کە بریتییە لە سیستێمی کارکردنی ڕیتم و سیستێمی بازنەیی دەقەکە ڕێڕەوەکەی دیاری دەکات (لە شیعری کێشراودا، هەنگاوەکان ئەو ڕۆڵە دەگێڕن). لە ئاستی ڕیتمیشدا، ئەو هەوڵە تێکدەرەی کە دابڕینی سیمانتی لە ڕێگای دەستەواژەکانەوە ئاراستەی سیستێمە بازنەییەکەی دەکات، وەکو ئەو ئەرکە وایە دیاردەیەکی دەنگیی زمان لە چەند جێگایەکی هەنگاوەکانی شیعری کێشراودا دەیگێڕێت. بەو شێوەیە، (ڕیتم) دەبێت بەناووکێکی سیمانتی و (کێش)یش دەبێت بەسیستێمی جووڵانەوەی ئەو ناووکە.
(١٨) پێویستە بگوترێت: بەهەندێ گۆڕانەوە" چونکە لە هەندێ شێوەی حەیراندا، ڕاناوەکان سەر بەکەسی دووەم، یان سێیەمی تاکن، ئەمەش دەبێتە هۆی گۆڕانی جۆر و کاتی فرمانەکان. بەو شێوەیە، بنیاتی سیمانتی دەبێت بەڕەنگدانەوەی بزووتنەوەکانی (پەیامگر)ی یەکەم لە دۆخی زاڵبوونی فرمانی کەسی دووەمی تاکدا، یان (پەیامگر)ی دووەم لە دۆخی زاڵبوونی فرمانی کەسی سێیەمی تاکدا، لە (بەند)ێکدا، یان پتر. بەڵام خاڵی گرنگ ئەوەیە سیستێمی گشتیی ئەو جۆرە شیعرە، هەمان بنیاتی داخراوی سیمانتی و سیستێمی بازنەیی ڕیتمییان هەیە.
(١٩) سوارچاکی لە لاوکی کوردی دا، ل١١-١٢.



(٢٠) Kurdish Grammar, P. 163.
(٢١) Ibid, P. 164-165.
(٢٢) لە دانیشتنێکی تایبەت بەبابەتەکەوە، حوزەیرانی (١٩٩٠).
(٢٣) Kilamed Gime’ ta Kurda, 12.
(٢٤) لەوە دەچێت (بەیت)ەکە بەتێکڕایی (٨) بڕگەیی بێت.
(د. خەزنەدار) لە بارەی نموونەیەکی دیکەی (بەیت)ەکەوە، ئەو لەنگییەی نیوە دێڕەکان بۆ هەڵەی نووسینەوە، یان خوێندنەوە دەگێڕێتەوە و بەدەستکارییەکی کەم دەیانکات بە(٨) بڕگەیی. ئەو بۆچوونە زۆر لەگەڵ ڕاستییە مەیدانییەدا دەگونجێت کە شیعری (٧) بڕگەیی لەو دوای شیعرە (٨، ١٠) بڕگەییەکانی فۆلکلۆر کەمترە، لەویش کەمتر- لە ڕاستیشدا تا پلەی دەگمەنی- شیعرە (٩) بڕگەییەکانن. دووریش نییە لە بنەڕەتدا (٧) بڕگەیی، یان (٨) بڕگەیی بن. بڕوانە:
کێش و قافیە لە شیعری کوردی دا، ل ٣٧.
(٢٥) Kurdish Grammar, P. 164.
(٢٦) لە کاتێکدا ئەم نامەیە بۆ چاپکردنی ئامادە دەکرا، وتارێکی چاکی (زاهیر ڕۆژبەیانی) لە بارەی (کێش)ی (لاوک و حەیران و بەیت)ەوە لە گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە (١٦٥)دا بەناوونیشانی (بۆچوونی چوارەم) بڵاوکرایەوە.
لە ڕاستیدا وتارەکە گەلێ بۆچوونی گشتیی بەکەڵکی تێدایە، لە نموونەی پۆلینکردنی ئەو جۆرە شیعرانە، شیعری بێ کێش کە بۆ دابینکردنی ڕیتمەکەیان پشت بە(ڕەزمی ناوەوە + سەروا) دەبەستن. ئاماژەکردنەکەشی بۆ (ڕستەی شیعری) بواری داوە بەشێوەیەکی دروست لە سروشتی قافیە لەو شیعرانەدا بگات. بەڵام لە پاڵ ئەو دەستکەوتە تیۆرییانەدا، هەندێ لایەنی پێچەوانەش تێبینی دەکرێن:
- وتارەکە ئاستێکی ڕووتی تیۆریی هەیە و (ڕۆژبەیانی هەوڵی نەداوە تەنانەت نموونەکانی خوێشی شی بکاتەوە. ئەو ونبوونەی ئاستی پراکتیکی، بۆتە هۆی تێکەڵکردنی سیستێمە ڕیتمییە جیاوازەکانی هەر یەکێک لە جۆرەکان و پۆلینکردنیان لە خانەیەکدا.
- هەرچەندە ئەم، وەکو (ئەحمەد حەیران)، دەستەواژەکانی(ئەمان، لێ لێ، لۆ لۆ) بەڕەگەزی دەرەکی دانانێت، بەڵام ئەو ئەرکەی پێیانی دەبەخشێت: خێرا

(خوێندن)ی دێرە درێژەکان و خاوکردنی دێرە کورتەکان و (...) بەکاربردنی هەندێ
وشەی وەک ئای و ئاخ ئۆف» وا دەکات «بەسەر (نەبوون)ی (کێش)دا زاڵ بن و،
ئەو بۆشاییییە پڕبکەنەوە کە ئەو (نەبوونی)یە دروستی دەکات»، ڕێبازێکی
ڕووتی مۆسیقاییە هەوڵ دەدات لە ڕێگای خاوکردنەوە و گرژ کردنەوەی
دەنگەکانەوە، (بار) ە مۆسیقاییییە لەنگەکان هاوکێش بکات. ئەو ئەرکەی
(ڕۆژبەیانی) بەو (وشانە)ی دەبەخشێت، دەقەکان لە شیعری کێشراو نزیک
دەکاتەوە.

- ئەگەر مەبەستی وتارەکە سەلماندنی (شیعرایەتی)ی لاوک و حەیران و بەیت بێت، ئەوا لە پێش ئەو بۆچوونە «ڕووکەش)انەی (ڕۆژبەیانی) ئاماژەیان بۆ دەکات، پانتاییییەکی فراوان لە لێکۆڵینەوە و وتاری تایبەتی هەیە: هەر لە بۆچوونەکەی ساڵی (١٩٦٢)ی (د. خەزنەدار)ەوە کە لە بواری حەیران و لاوکدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات «سەربەستی کێش لە شیعری کوردی دا ڕووداوێکی بنچینەیی مێژوویی زمانی کوردییە، بۆیەش شیعری تازە لە ڕووی ڕوخسارەوە، دەیەوێ بگەڕێتەوە سەر ئەو یاسا ئازادە کۆنە، وە ڕزگاری ببێ لە پێوەندی یەکیەتی کێش و قافیە». بڕوانە: کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، ل ٤٣، تا دەگاتە بۆچوونەکەی (د. شوکریە ڕەسوول) لە بارەی پەخشانە شیعریی حەیرانەوە لە پاشکۆی (عیراق)ی ژمارە (٣١)ی ساڵی (١٩٨٨)دا.

(٢٧) گۆرانی یا ترانەهای کوردی، ل١٠١.
(٢٨) ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١١).
(٢٩) سینتاکسی ڕستەی سادە، ل ٨٤.
(٣٠) گۆرانییەکان لەم سەرچاوانەدان:
- گۆرانی یا ترانەهای کوردی: گۆرانی ژمارەکانی: (١-١٥) (٢٢٦-٢٣٠) (٣٣١-٣٣٦) (٣٥٣- ٣٥٥) (٤١٤-٤٣٧).
- گەنجینەی گۆرانی کوردی، عثمان شارباژێری، بەغدا، ١٩٨٥.
گۆرانیی لاپەڕەکانی: (٨٠- ٨٣) (٩٢- ١٠٤) (٢١٦- ٢٨٨).
- شیعری فۆلکلۆری کوردی، فاروق حەفیدزادە، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ١٩٨٢.
گۆرانیی لاپەڕەکانی: (١٦، ٢٤، ٣٦، ٣٩، ١٥٥، ١٥٦، ١٨٩، ٢٠٩، ٢٢٨، ٢٢٩، ٣٠١، ٣٠٢، ٣٠٣).
- ژیان و ڤیان، ئەمینی ئوسمان، بەغدا، ١٩٨٦.



گۆرانیی لاپەڕەکانی:(٣٦، ٤٩، ٩٦، ١٠٢، ١٠٣، ١٠٤، ١٠٥، ١٦٥، ٢٠١).
(٣١) ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٥).
(٣٢) الاصوات اللغویه، ص ١٧١.
(٣٣) نظریه ایقاع الشعر العربی، ص ٤٦.
(٣٤) فی البنیه الایقاعیه للشعر العربی، ص ٣٦٤.
(٣٥) بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردی دا، ل ١٥٧.
(٣٦) سەرچاوەی پێشوو، هەمان جێگا.
(٣٧) «دانەی فۆنەتیکی)، وەکو (دڵشاد) بەکاری دەهێنێت، لەبار نییە؛ چونکە ئەو دانەیە (یەکە) یەکی دەنگیی ڕووتە و تەنیا لە بەکارهێناندا کەسایەتیی ڕاستەقینەی خۆی بەدەست دەهێنێت.
بە نموونە (فۆنیم)، کە (یەکە) یەکی دەنگیی زمانە، لە ئاخاوتندا وەکو (ئەلەفۆن) بەرجەستە دەکرێت، ئێمە کاتێ دەدوێین (ئەلەفۆن) بەکار دەهێنین نەک (فۆنیم). بەو شێوەیە، «دانەی فۆنەتیکی» وەکو (یەکە) یەکی ڕووت، لە کۆمەڵەی دەنگیدا وەکو «دانەی فۆنۆلۆژی» بەکار دەهێنرێت. ئەم دەستوورە، کە لە لێکۆڵینەوە زمانییەکاندا بە(ئیم) ناسراوە، هەموو ئاستە زمانییەکان دەگرێتەوە. بڕوانە: الاصوات اللغویه، ص٥٨-٢٢٦.
لە بواری کێشی برگەییشدا، شیعری (ژاپۆنی)، کە بەگوێرەی زاراوەکەی (أبو دیب) وەکو «دانەی فیزیکی» لە برگە دەڕوانێت، لە بەر ئەوەیە برگەکان وەکو (دانەی فۆنۆلۆژی)یش، لە چەندێتیدا ئەوەندەی یەکن.
کەواتە، تەنانەت لە ڕوانگەی کێشی برگەیی ڕووتیشەوە، ناتوانرێت- بێ ڕەچاوکردنی پێویستییەکانی فۆنۆلۆژی- برگە بە«دانەی فۆنەتیکی» دابنرێت. شیعری (فەرەنسی) نموونەیەکی گەشتر پێشکەش دەکات. دانانی برگەی ئەو شیعرە بە«دانەی فۆنەتیکی»، ئەو چەندێتییە درێژەی دوا برگەی (هەنگاو)ەکان پشتگوێ دەخات کە سترێسێکی بەهێز بەرجەستەی دەکات. بەو شێوەیە، هەر بڕیارێک بۆ دانانی (برگە) بە«دانەی فۆنەتیکی»، لە هەموو بارێکدا ئاماژە بو چەمکێکی ڕووت دەکات. ئەم ڕاستییە، هەموو ڕەوابوونی (کێشی برگەیی)، وەکو زاراوە و پۆلینکردنیش، دەخاتە گومانەوە.
(٣٨) بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردی دا، ل ١٥٦.
(٣٩) لە دێرە شیعرێکی وادا، کە سیستێمی کۆمەڵە دەنگییەکان ڕێکییەکی

بەرچاو پیشان دەدات، ئەوپەڕی مەترسی لە دابەشکردنی بڕگەکانی دێڕە شیعری فۆلکلۆری بەسەر (هەنگاو)ی هاوسەنگدا، دەردەکەوێت.

ئەگەر بڕگەکان لە (هەنگاو)ی دووبڕگەییدا کۆبکەینەوە، کێشی نموونەیی (ترووکی)ی چوار (هەنگاو)ی ئینگلیزیمان دەست دەکەوێت:

نەمەجـ/ نوونم/ نەفەر/ هادم// زەحمەت/ کێش و/ ڕەنج بە/ بادم - وەکو (هەنگاو)ی چوار بڕگەییش، نیوە دێڕی یەکەم بێ دەستکاری، (سەدر)ێکی دوو (هەنگاو)یی (هەزەج)ی (سالیم)ی عەرووزیمان پیشان دەدات:

نە مەجنوونم / نە فەرهادم

مەفاعیilون / مەفاعیilون

نیوە دێڕی دووەمیش، وەکو (مندور) ڕوونی دەکاتەوە، لە خوێندنەوەدا لە کێش و ڕیتمی نیوە دێڕی یەکەم نزیک دەکرێتەوە.

کەواتە (هەنگاو)ی هاوسەنگ، یەکە دوژمنی کێشی خۆماڵییە، بەڵام خۆشبەختانە هەموو دێڕەکانی فۆلکلۆر ئەو سیستێمە ڕێکەیان نییە، کە ڕەنگە بەهۆی کارتێکردنی عەرووز و هەندێ لە شاعیرە میللییەکانەوە لە شیعرەکەدا تەشەنەی کردبێت.

ئەو هەمە ڕەنگییە ڕیتمییەی نموونە (فێ) بەرجەستەی دەکات، تا چ ڕادەیەک ڕێگا بەجیاکردنەوەیەکی دروستی سیستێمە ڕیتمییە جیاوازەکان دەدات؟ وەڵامی تیۆرییانەی ئەو پرسیارە لە (فەسڵی یەکەم، ١- ٥- ٣)دا دراوەتەوە، لێرەشدا دەتوانین وەڵامێکی پراکتیکی گەڵاڵە بکەین.

لە ئاستی کێشدا، هەرسێ شێوە ڕیتمییەکەی نموونە (فێ)، هاوسەنگن.

لەم ئاستەدا کە ئاستی (توانا)یە، هیچ جیاوازییەک لەنێوان شێوە ڕیتمییەکاندا نییە، ڕێک وەکو کو سێ پارچە مۆسیقا بە(نۆتە) کراوی.

لە ئاستی ڕیتمدا، کە ئاستی (جێبەجێکردن)ە، شێوەکان بەگوێرەی سیستێمەکانی ڕیتم و ئەدگارەکانی زمانی شیعرەکە، قەوارەی سەربەخۆپێکدێنن.

خوێندنەوەی ئینگلیزێک بۆ نموونەکە، لە هەر نیوە دێڕێکدا (٤) وەستانی ڕێکی کاتیی دروست دەکات، بەڵام خوێندنەوەیەکی عەرووزی (٢) وەستان پێک دەهێنێت. کەچی لە خوێندنەوە کوردییەکەدا، (٤) مەڵبەندی ناڕێک، بێ وەستان، بنیاتی ڕیتمی هەر نیوە دێڕێک دروست دەکەن.

**پا- ۱ ئەنجامەکان:**

پا-۱-۱- هەڵسەنگاندنی هەندێ لە پێناسە و تیۆرییە ناسراوەکانی (کێش) و (ڕیتم)، دەریخست ئاستەکانی ئەو دوو ڕەگەزە لە یەکتر جیان. (کێش) لە هەموو شیعری کێشراوی جیهاندا، بریتییە لە هاوژمارەیی بڕگەکان لە هەردوو نیوە دێڕی شیعردا.

(ڕیتم)یش لە دووبارەکردنەوەی دیاردەیەکی گرنگی دەنگی لە چەند جێگایەکی ڕێک، یان نزیکی بڕگەکاندا دروست دەبێت.

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو ئەنجامە تەنیا شیعری کێشراو دەگرێتەوە، هەوڵ درا لە دەروازەی ئامرازێکی ئاودانی خۆماڵییەوە: (ئەستێل)، بەشێوەیەکی فراوانتر پەرە بەچەمکەکانی (کێش) و (ڕیتم) بدرێت. بەگوێرەی ئەو بۆچوونە، کە لە پێناسەکردنی ڕیتمەوە سەرچاوە دەگرێت، (ڕیتم) لە کۆسیستێمەکانی ئاخاوتن پێکدێت. بەدەربڕینێکی دیکە، لەبەر ئەوەی (واتا)، بنیاتی قووڵی ئەو کۆسیستێمانە پێک دەهێنێت، (ڕیتم) دەبێت بەناوکی (واتا)، یان وەکو بزووتنەوەی (واتا) خۆی دەنوێنێت (کێش)یش بریتییە لە سیستێمی دیاریکراوی ئەو بزووتنەوەیە.

پا- ۱- ۲ شیکردنەوەکان سەلماندیان سیستێمی ڕیتمیی جۆرەکانی شیعری فۆلکلۆری کوردی جیاوازن، هەر سیستێمەش لە ڕێگای دیاریکردنی بنیاتە سیمانتییەکەیەوە دەسنیشان دەکرێت.

پا- ۱- ۳ جۆرەکانی شیعری فۆلکلۆری کوردی، لە ڕووی سیستێمی ڕیتمەوە دوو دەستەن: لە ڕووی بابەتەوە بریتین لە شیعری خودی: (لیریک) و شیعری داستانی: (ئیپیک). لە ڕووی سیستێمی کێشیشەوە بریتین لە شیعرە بێ کێشەکان: (حەیران، لاوک) و شیعرە کێشراوەکان: (بەیت، گۆرانی).



پا- ۱- ٤ ڕیتم لە (حەیران)دا سیستێمێکی بازنەیی پێک دەهێنێت، هۆکەشی ئەوەیە بزووتنەوەی سیمانتی، لەبەر ئەوەی لە پەیامدەرەوە دەجووڵێت و بۆ خودی پەیامدەر دەگەڕێتەوە، بنیاتێکی داخراو دروست دەکات.

لە ئاستی دەنگیشدا، بزووتنەوەکە لە ڕێگای دوو شێوەی دووبارەکردنەوە دەردەکەوێت: یەکەمیان دووبارەکردنەوەی فۆنیمییە: (قافیەی ڕواڵەتی) کە پتر پشت بەزرمەیەکی بەهێز دەبەستێت.

دووەمیشیان دووبارەکردنەوەی مۆرفیمییە، کە مەڵبەندە ڕیتمییەکانی ڕستە شیعرییەکان پێک دەهێنن. لە هەمان کاتدا، ئەو بێ هوودەییەی دووبارەکردنەوەی (واتا) بازنەییەکان دروستی دەکەن، لە ڕێگای دووبارەکردنەوەی چەند دابڕە ڕیتمییەکی وەکو (براینە، برادەرینە... هتد) تێکدەدرێت.

دەسنیشانکردنی سیستێمی ڕیتم لە (حەیران)دا، وەکو لەم باسەدا پێڕەوی کراوە، بەم هەنگاوانەی خوارەوە ئەنجام دەدرێت.

۱- دیاریکردنی بزووتنەوەی بنیاتی سیمانتی، لە ڕێگای پۆلینکردنی ڕاناوەکانی (بەند)ێک، یان هەموو (بەند)ەکان وکاتی کردارەکانیانەوە.

۲- جیاکردنەوەی ڕستە شیعرییەکان بەجیاکردنەوەی سنوورە سیمانتییە سەربەخۆکانیان.

۳- هەر ڕستەیەکی شیعری، دوو مەڵبەندی ڕیتمیی سترێسی (واتا)ی تێدایە: یەکێکیان فرمانی سەر بەپەیامدەر پێکی دەهێنێت، دووەمیشیان لە دوابڕگەی ڕستەکەدایە، کە ڕۆڵی (قافیە) دەگێڕێت.

پا- ۱- ٥ (لاوک) بنیاتێکی کراوەی ئاسۆیی هەیە، ئەوەش بەهۆی زاڵبوونی سروشتی گێڕانەوە، بەسەر بزووتنەوە سیمانتییەکاندایە. ئەو بنیاتە کراوەیە، کە لە (یەکە) یەکی سەرەکی: (پەیامە بنەچەییەکە) و

(یەکە) یەکی لاوەکی: (ڕووداوە تەواوکەرەکان) پێکدێت، سیستێمێکی ڕیتمیی پەیژەیی دروست دەکات. ئەو سیستێمە پەیژەیییە، لە دوو شێوەدا بەرجەستە دەکرێت: یەکەمیان بەکەڵەکەکردنی ڕستە هاوتەریبەکان، کە ڕستەی دواتر لەوی پێشووتر واتا هەڵگرتر و بەهێزترە. دووەمیشیان بەرەچاوکردنی پتری فۆنیمە هاودەنگەکان لە کۆتایی ڕستەکاندا، کە سەرەڕای هێزی ڕستەکان، هێزی ئاسایی (قافیە)ی ڕواڵەتیش وەردەگرن.

سیستێمی ڕیتم لە (لاوک)دا، دەشێ بەم ڕێگایانەی خوارەوە دیاری بکرێت:

١- بۆ دیاریکردنی بنیاتی سیمانتی، پێویستە سێ تەوەر لە دەقەکەدا شی بکرێتەوە: یەکەمیان تەوەری ڕێزمانییە، کە لە ڕێگایەوە ڕستەکانی دەقەکە جیا دەکرێنەوە. دووەمیان تەوەری پەیامی دەقەکەیە، کە بۆ ڕەچاوکردنی ڕادەی گەشەکردنی واتاکان لە سنووری ڕستە هاوتەریبەکاندا بایەخێکی گرنگی هەیە. سێیەمیشیان تەوەری هێماکانە، کە یارمەتییەکی پێویست بەدەسنیشانکردنی جۆر و جێگای مەڵبەندە ڕیتمییەکان پێشکەش دەکات.

٢- ڕستە شیعرییەکان لە ڕووی ڕیتم و واتاوە، بەگوێرەی سیستێمێکی پەیژەیی گەشە دەکەن. لەبەر ئەوە پێویستە هەر کۆمەڵەیەکیان بەپێی ڕادەی ئەو واتایەی دەیبەخشن، لە خانەیەکدا پۆلین بکرێن.

٣- لە بنیاتی ڕیتمیدا، شێوەی دابەشکردنی ڕێژەی سترێسەکان، پێوەندیی بەچڕیی ڕستە شیعرییەکانەوە هەیە. هەر کۆمەڵە ڕستەیەک، کە بەشەکانی هەمان واتا بەشێوەی جیاواز دووبارە دەکەنەوە، سترێسەکەیان سترێسی ڕستە دەبێت، واتە دوا وشەی ڕستەکە، بەزۆریش دوا برگەی ئەو وشەیە وەکو (قافیە)، سترێسەکە هەڵدەگرێت.

٤- گۆڕانی سترێسی، بۆ سترێسی وشە، پێوەندیی بەکەڵەکە بوونی



وێنە و هێماکان لەڕستە شیعرییەکانی پێش کۆتایی(بەند)ەکانەوە هەیە.

٥- بەهۆی سروشتی بەردەوامبوونی ڕووداوەکانەوە، پەیامدەر ناچار دەبێت لە هەر ماوەیەکدا سنوورێکی (کات)ی بۆ گێڕانەوەکان دابنێت. بۆ ئەو مەبەستەش هەندێ شێوەی (مۆرفۆ- فۆنیمی)ی لێکچووی وەکو (لاوۆ، لێ لێ، لۆ لۆ... هتد) لە کۆتایی (بەند)ەکاندا دووبارە دەکاتەوە، کە لە ڕاستیدا دوو ئەرکی تەواوکەری سیمانتی و پشوودانی ڕیتمی جێبەجێ دەکەن.

پا- ١- ٦ (بەیت) و (گۆرانی)، کە لە بنەڕەتدا لە خانەی شیعری کێشراودان، یەک سیستێمی ڕیتمیان هەیە.

لە ئاستی کێشدا، هەردووکیان لە نیوە دێڕێکی شیعردا هەمان ژمارەی برگە، یان نزیک لەو ڕێژەیە، ڕەچاو دەکەن.

لە ئاستی ڕیتمیشدا، کۆمەڵە دەنگییەکان بەگوێرەی بنیاتی مۆرفۆلۆژییان، سترێسی واتا هەڵدەگرن.

بۆ خوێندنەوەیەکی دروستی ڕیتمی و دیاریکردنی جێگای سترێسی شیعری، لە دێڕە شیعرێکی (بەیت)، یان (گۆرانی)دا، ڕەچاوکردنی ئەم خاڵانەی خوارەوە یارمەتییەکی شیاو پێشکەش دەکات:

١- جیا کردنەوەی دەستە دەنگییەکان، کە مەڵبەندە ڕیتمییەکانی شیعرەکە پێک دەهێنن. بۆ ئەو مەبەستەش، لە سەرەتادا ڕستە شیعرییەکان جیا دەکرێنەوە کە بەگشتی بەسەر دوو جۆرە بنیاتی سینتاکسیدا دابەش دەکرێن: یەکەمیان ڕستەی تەواوە لە هەر نیوە دێڕێکی شیعرەکەدا، لە جۆری دووەمیشدا. هەر نیوە دێڕێک ڕستەیەکی ناتەواو پێک دەهێنێت و ڕستەی نیوە دێڕی دووەم تەواوکاری سیمانتیی ڕستەی نیوە دێڕی یەکەمە. هەر ڕستەیەکیش لە هەردوو جۆرەکەدا، هێڵێکی ئاوازەیی تایبەت بەخۆی هەیە لە ڕێگای دەسنیشانکردنی شێوازە سیمانتییەکەیەوە دیاری دەکرێت.

٢- ئەو ڕستە شیعرییانەی لە نیوە دێڕی یەکەمدا واتاکانیان تەواو

دەبێت، دەکرێن بەدوو ڕستەی ناتەواو: یەکەمیان شێوازێکی پرسیاری
دەبێت و دووەمیشیان شێوازی وەڵامدانەوە. شێوازی یەکەم هێڵێکی
ئاوازەیی بەرز و شێوازی دووەم هێڵێکی نزمی دەبێت.

ئەگەر ڕستەی ناتەواوی یەکەم لە دوو وشە پێکهاتبوو، وشەی
یەکەمیان هێڵە بەرزەکە وەردەگرێت و وشەی دووەمیان هێڵەکەی نزم
دەبێتەوە. ئەگەریش وشەکان لێکدراوبوون، هێڵە ئاوازەییەکەی خۆیان
دەپارێزن، لەم دۆخەشدا بەشی یەکەمی وشە لێکدراوەکە سترێسێکی
بەهێز وەردەگرێت. ڕستەی دووەمی نیوە دێڕی دووەمی شیعرەکە، هەمان
دارشتنی دەبێت.

٣- ئەو ڕستە شیعرییانەی لە نیوە دێڕی یەکەمدا واتایان تەواو نابێت
(با لە رووی سینتاکسیشەوە ڕستەی تەواو بن) بەگشتی هێڵێکی
ئاوازەیی بەرزیان دەبێت، بەڵام لە پرۆسێسی کارلێککردنی بنیاتی
سیمانتی و سینتاکسی لە بۆتەی شیعریدا، یەکە مۆرفۆ- سیمانتییەکان
دوو ڕۆڵی بنەچەیی دەگێڕن:

یەکەمیان ئەوەیە هەر (یەکە) یەک وەکو ڕستەیەکی تەواو، شێوازێکی
سەربەخۆی سیمانتی وەردەگرێت: (ڕستەی مۆرفیمی).

دووەمیشیان ئەوەیە هەر (یەکە) یەک وەکو کۆمەڵە سەربەخۆی
دەنگیی، مەڵبەندە ڕیتمییەکانی نیوە دێڕەکە دیاری دەکات.

بەو شێوەیە، (یەکە)ی یەکەم شێوازێکی پرسیار و (یەکە)ی دووەم
شێوازێکی وەڵام... هتد لەخۆ دەگرن. نیوە دێڕی دووەمیش بەو جۆرە
دەبێت.

٤-گۆڕینەوەی هێڵە ئاوازەییەکان بەسترێسی سەرەکی،دوو فۆرمۆلی هەیە:

یەکەمیان بەدانانی نیشانەی سترێسی سەرەکی لەسەر دوا بڕگەی هەر
دەستە دەنگییەک هێڵێکی ئاوازەیی بەرزی هەبێت. دووەمیشیان لەسەر
بڕگەی پێش کۆتایی هەر دەستە دەنگییەک هێڵێکی ئاوازەیی نزمی
هەبێت.



٥- هەرچەندە ڕستەی هێڵە ئاوازەییەکان بەگشتی، بەپلەیەکی
ئاسایی دەست پێدەکەن، بەڵام هەندێ جار بەهۆی پێشکەوتنی مۆرفیمە
سترێس بنەچەییەکانی وەکو ئامرازەکانی (نەرێ) و (بانگهێشتن) و
دۆخی دیکەوە، پلە ئاوازەییەکان (کولتوور) پێک دەهێنن. لەبەر ئەوە،
بێ گوێدانە ئەو دەستوورە گشتییە، بەسترێسی بەهێز دەست پێدەکەن.

٦- هەندێ جار ئەو دەستە دەنگییانەی هێڵێکی ئاوازەیی نزمیان
دەبێت، بەهۆی جێگایان لە دوا ڕیزی دەستەکانی نیوە دێڕی یەکەم و
دووەمدا: (قافیە)، سترێسەکەیان لە بڕگەی پێش کۆتاییەوە بۆ دوا
بڕگەی دەستەکە دەگوێزرێتەوە.

**پا- ٢ پێشنیازەکان:**

لەبەر نەتوانین و کەمیی ماوە و کەرەسەی پێویست، هەندێ لەو
لایەنانەی نامەکە بەناتەواوی جێی هێشتوون، لەم خاڵانەی خوارەوەدا
بەشێوەی پێشنیاز بۆ کارەکانی داهاتووی ڕەخنەی شیعری کوردی، تۆمار
دەکرێن:

١- لە پێناوی پێناسەکردنێکی بابەتیانەتری (کێش) و (ڕیتم)دا،
لێکۆڵینەوەیەکی شێوازەگەری (اسلوبی) دەتوانێت، پشت بەبۆچوونەکەی
(سوسۆر: زمان- ئاخاوتن) و (چۆمسکی: بنیاتی سەرەوە- بنیاتی
قووڵ)، لەبەر ڕووناکیی ئەو دابەشکردنەی نموونە تێورییەکەی (ئەستێل)
بەرچاوی دەخات، تێگەیشتنێکی وردتر و پێناسەکردنێکی گشتیتری
ئەو دوو ڕەگەزە شیعرییە بکات.

٢- زاراوەی (وەزنی هیجایی) و (کێشی بڕگەیی) و (کێشی
پەنجە)، کە یەک چەمکیان هەیە، لە بواری بەکارهێناندا بۆ شیعری
فۆلکلۆری کوردی ناکۆکییەکی دوولایەنی دروست دەکات:

بەشی یەکەمی هەر یەک لە زاراوەکان: (وەزن، کێش)، تەنیا شیعرە
کێشراوەکان دەگرێتەوە.

بەشی دووەمیشیان: (هیجا، برگە، پەنجە) چەمکێکی ڕووت هەیە، لە بواری شیعری فۆلکلۆریشدا دەرکەوت، ئەو برگەیە دۆخی فۆنیمیی هەیە.

لەبەر ئەوە پێشنیاز دەکرێت ئەو جۆرە زاراوانە لە بواری ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی شیعری فۆلکلۆریدا بەکار نەهێنرێن. تا ئەو دەمەش زاراوەیەکی لەبارتر ساز دەدرێت، زاراوەی (کێشی خۆماڵی) لە هەموو ئەوانی دیکە لەبارترە.

٣- هەرچەندە بنیاتی سیمانتی و سیستێمی ڕیتمیی شیعرە بێ کیشەکان، پێکهاتنێکی گشتییان هەیە کە لە باسەکانی ئەم نامەیەدا دەسنیشان کران، بەڵام بێ گومان گەلێ شێوە و وێنەی جۆر بەجۆری دیکەی هونەرییان تێدایە شیکردنەوەی قووڵتر دەتوانێت بیاندۆزێتەوە.

٤- دەسنیشانکردنی دوو بنیاتی سینتاکسی بۆ ڕستە شیعرییەکانی شیعری کێشراوی فۆلکلۆری، لەسەر بنچینەی ئەژمارێکی فراوان ئەنجام نەدراوە، لەم بوارەدا، ئەژمارێکی وا دەتوانێت ئەو بنیاتانە لە چەند خانەیەکی دیاریکراودا پۆلین بکات، لەو ڕێگایەشەوە بۆی هەیە یارمەتییەکی گونجاو بەدەسنیشانکردنی چەند سیستێمێکی جێگیر پێشکەش بکات، بتوانرێت بنیاتێکی ڕێکتری ڕیتمی بۆ شیعری کێشراو لەسەریان دابڕێژرێت.

٥- هەرچەندە بەراووردکردنی شیعری هاوچەرخی کوردی لەگەڵ سیستێمە ڕیتمییەکانی دیکەدا، لە سنووری مەبەستەکانی ئەم نامەیەدا نەبوو، بەڵام لایەنێکی گرنگی ئەنجامەکان، ئەو شیعرەش دەگرێتەوە کە خۆی بەمیراتگری گەنجینەی فۆلکۆر دادەنێت.

لە ڕاستیدا سنووری نێوان کێشی خۆماڵی و ئەو دوای سیستێمە کێشەکانی دیکە، تەنیا موویەکیان نێوانە کە هێڵی جیاکردنەوەی (هەنگاو)ەکان بەرجەستەی دەکات.

هەر هەوڵدانێک بۆ هۆنینەوەی شیعرێک لە چواچێوەی ڕەچاوکردنی



(هەنگاو)ی هاوسەنگدا، ڕیتمی شیعرەکە، لە (مۆسیقا)ی یەکێک لە سیستێمە قاڵبییەکان بەئەندازەیەکی گەورە نزیک دەکاتەوە.

بۆیە پێشنیاز دەکرێت، شاعیر لە کاتی هۆنینەوەی شیعری کێشراو و سەربەستیشدا، بایەخ بەکۆکردنەوەی برگەکان لە کۆمەڵە دەنگیی هاوژمارە لەسەرتاسەری دێڕ و شیعرەکاندا نەدات.

ڕاستە گەلێ جار لە تاقیکردنەوەی شیعریدا، وێنە و ڕستە شیعرییەکان خۆیان بەسەر توانای هەڵبژاردنی شاعیردا دەسەپێنن و ناتوانرێت وەکو دوگمەی کەناڵەکانی تەلەفزیۆن ڕەفتاریان لەگەڵدا بکرێت، ئەمەش ئەرکێکی عەوازە لە ئەستۆی شاعیر دەگرێت. بەڵام ئەگەر ئاڵۆزیی کاری شیعری و کەسایەتیی سەربەخۆی بنیاتە ڕیتمییەکەیان لە زەیندابێت.

پێشنیازێکی وەکو ئەوەی بەرچاومان خست، ناچێتە سنووری مەحاڵەوە.

بەو شێوەیە- تەنیا هەر بەو شێوەیەش- دەقی شیعری دەبێت بەبەرهەمێکی هاوبەشی (شاعیر- خوێنەر) کە هەر یەکەیان بەجۆرێک بەشداری لە بەرهەمهێنانیدا دەکات:

شاعیر تا بۆی دەکرێت- بەبەکارهێنانی وشەی (٢، ٣) برگەیی کە زۆربەی وشە کوردییەکان پێک دەهێنن- ڕستەکانی لە چەمکی (هەنگاو)ی هاوکات دوور ڕادەگرێت، بەوەش خوێندنەوەیەکی کوردی بۆ خوێنەر دیاری دەکات، ئەگەر لە چەند جێگایەکیشدا لەو ڕێڕەوە لایدا، خوێنەر خۆی ئەو لادانە ڕاست دەکاتەوە. کەواتە ڕەچاوکردنی ئەو ڕێڕەوە، یەکێک لە وێنەکانی ڕیتمی دێڕە شیعرێکی کوردی نییە، بەڵکو تاکە وێنەیەکە دێڕە شیعرەکەی پێ دەخوێنرێتەوە. هەر لێرەشەوەیە لە سنووری شیعرێکی (٨) برگەییدا، بەنموونە بنیاتی ڕیتمی شێوە کوردییەکەی، لە سیستێمەکانی دیکە هەمە ڕەنگتر دەبێت.

## پاشکۆی ژماره (۱)

### سیستێمەکانی کێشی جیهانی

دەتوانین پۆلینکردنەکەی (لۆتز)، بەیەکێک لە هەوڵە ناسراوەکان لە بواری دابەشکردنی سیستێمە باوەکانی کێشی شیعردا بژمێرین.

(لۆتز) شیعری جیهانی بەسەر دوو خانەدا دابەش دەکات:

(۱) کێشە سادەکان: هاوژمارەیی دێڕەکانی شیعر، لە ئەدگارە سەرەکییەکانی ئەم کێشانەن. هەموو کێشە برگەییەکان لەم خانەیەدان.

(۲) کێشە لێکدراوەکان: (لۆتز) لەم خانەیەدا سێ جۆرە شیعر دادەنێت کە دیارترین ئەدگارەکانیان، سەرەڕای ژمارەی برگەکان، دووبارەبوونەوەی رێکی ئەو برگانەیە. شیعرەکانی ئەم خانەیەش بریتین لە (شیعری ئاوازەیی- دووبارەکردنەوەی یەکە ئاوازەییەکان) و (شیعری دینامی- چۆنی) و (شیعری کاتی- چەندی).

سەرەکیترین ناکۆکی لە پۆلینکردنەکەی (لۆتز)دا، دانانی (شیعری ئاوازەیی) لە خانەی کێشە لێکدراوەکاندایە. لە کاتێکدا ئەو کێشە، بەگوێرەی دیاریکردنەکەی خۆی، (یەکە) ریتمییەکانی بەرێکی دووبارە ناکرێنەوە. بەڵام (لۆتز)، لەبەر ئەوەی (شیعری ئاوازەیی) لە هەمان کاتدا، جگە لە ژمارەی رووتی برگەکان، ئەدگارێکی گرنگی زمانیش بەکار دەهێنێت، لە توانایدا نییە لە خانەی کێشە سادەکاندا دایبنێت.

بڕوانە وتاری: نحو علم العروض المقارن، سيد البحراوي، ألقيت في المؤتمر الثاني للرابطة العربية للادب المقارن، دمشق، ١٩٨٦.

لە هەمان روانگەوە، (ابو دیب) بەبەکارهێنانی هەندێ زاراوەی جیاواز، وەکو (لۆتز)، شیعری جیهانی بەسەر دوو دەستەدا دابەش دەکات:

١- ئەو شیعرانەی تەنیا بایەخ بە«بوونی فیزیکی» برگەکان دەدەن، لە



نموونەی شیعری (فەرەنسی) و (ژاپۆنی): دەستەی (B).

٢- ئەو شیعرانەی پێوەندییەکی دیاریکراوی ئاسۆیی لەنێوان دوو یەکەی ریتمیدا بەکاردەهێنن، وەکو شیعری (عەرەبی) و (ئینگلیزی) و (ئەڵەمانی) و (یۆنانی): دەستەی (A).

بەڵام (ابو دیب)، لەبەر ئەوەی شیعری (ئەڵەمانی) هەمان جووتییەکەی ریتمی رەچاو ناکات کە شیعرێکی وەکو (ئینگلیزی) بەکاری دەهێنێت، ناچار دەبێت شیعرەکانی دەستەی (A) بکات بەدوو بەشەوە و لە دواییشدا بڕیار بدات شیعری (ئەڵەمانی) سەر بەدەستەی (B)یە. بڕوانە: في البنية الايقاعية للشعر العربي، ص ١٨٣.

یەکێک لە هۆکارەکانی ئەو ئاڵۆزییانە، بۆ دابەشکردنی شیعری کێشراوی جیهانی بەسەر دوو دەستەدا دەگەڕێتەوە. لە نەخشەی (پا-١)دا، پێڕەوی لە دابەشکردنێکی جیاواز کراوە سەرەڕای پشتگوێ خستنی دابەشکردنە دوو لایەنێکە، شیعری (دینامی) لە جۆری (چەندی) جیاکراوەتەوە، کە لە راستیدا پێڕەوی لە سیستێمێکی قاڵبی دەکات و لە جێگای شیاوی خۆیدا پۆلینکراوە، کە شیعرە فۆلکلۆرییەکان بەتەواوی نوێنەرایەتیی دەکەن.

بە گوێرەی ئەو بۆچوونە، مەبەستێک ئاشکرا دەبێت کە لە (فەسڵی یەکەم، ١- ٣- ٣، تێ)دا حەشار دراوە: شیعری جیهانی، وەکو رێڕەوێکی لێک نەپچڕاوی مێژوویی، بەسێ قۆناغی گەشەکردندا تێپەڕیوە: قۆناغی شیعری بێ کێش کە پاشان شیعری کێشراوی فۆلکلۆری: (دینامی)ی لەسەر دامەزدا، ئەم شیعرە هەر زمانە و دوور لە نموونەیەکی قاڵبی، بەگوێرەی ئەدگارەکانی خۆی بەکاری دەهێنێت. لە قۆناغی سێیەمیشدا، چەند نموونەیەکی تیۆری بۆ سیستێمەکان دەسنیشان کران و ئەو دوای وێنە ریتمییەکانیان لێ دەرکێشرا، بەو شێوەیە، لە سنووری شیعری کێشراودا، سیستێمی (پێوانەیی)، وێنەیەکی رێکخراوتری سیستێمی (دینامی)یە.




نەخشەی (پا – ١)
سیستەمەکانی کێشی جیهانی



## پاشکۆی ژمارە (٢)

### سنووری نێوان عەرووز و کێشی خۆماڵی

یەکێک لە دیاردە نادروستەکانی بەراووردکردنی کێشی خۆماڵی و کێشی عەرووزی، شیکردنەوەی سەر کاغەزییە، واتە ڕاگرتنی بڕگە کورت و درێژەکانی شیعری هەردوو کێشەکە، لە بەرامبەر یەکتردا، لە کاتێکدا (مۆسیقا)ی شیعرەکان، پێوەری ڕاستەقینەی جیاوازیی دوو سیستێمی شیعرییە.

لەم دێڕە شیعرەی (وەفایی)دا، کە (سەججادی) بەنموونەی کێشی خۆماڵیی دادەنێت، ئەو دیاردەیەی پێشوو بەڕوونی دەردەکەوێت:

لەبەر نازی چاوبازان خورد و خاوم نەماوە
بە تیری تیرەندازان چبکەم جەرگم بڕاوە

(نرخ شناسی، ل ١٢٦)

ئەگەر بەگوێرەی ڕیزبوونی بڕگە کورت و درێژەکان لە نیوە دێڕی یەکەمی شیعرەکە بڕوانین، ئەم سیستێمەی خوارەوە دەبینین:

| لەبەر نازی | چاوبازان | خورد و خاوم | نەماوە |
|---|---|---|---|
| ب– – – | – – – ە | – ب – – | ب – – |
| مەفاعییلون | مەفعوولات | فاعیلاتون | فەعوولون |

کە لەگەڵ هیچ کێشێکی ناسراوی عەرووزیدا ڕێک ناکەوێت.

بەڵام ئەگەر سەرنجی (مۆسیقا)ی شیعرەکە بدەین، دەبینین – بەنموونە– هەمان ئاوازی شیعرە بەناوبانگەکەی شاعیر خۆی: (شیرین تەشی دەڕێسێ)ی هەیە کە دێڕی یەکەمی بەم جۆرە دەست پێدەکات:

تاێیکی ڕیشەیی دڵ بەنوکی غەمزە دادا
دەستێکی بۆ سەما برد ڕوبەندی ماهی لادا

(دیوانی وەفایی، ل: ١٩٢)

شیکردنەوەکەشی بەم شێوەیەیە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| تاییێکی | ڕیشەیی دڵ | بەنوکی | غەمزەدادا |
| دەستێکی | بۆ سەما برد | ڕوبەندی | ماهی لادا |
| مەفعوولو | فاعیلاتون | مەفعوولو | فاعیلاتون |

کە کێشی عەرووزی (موزاریعی هەشت هەنگاویی ئەخرەب)ە و لەم چەشنە شیعرە، لە جێگای دیکەی دیوانەکەدا بەرچاو دەکەوێت:

شیعری «ژمارە (٥)، ل: ٧» و شیعری «ژمارە (٨)، ل: ٥٦» بەنموونە.

کەچی لە زۆربەی دێڕەکانی ئەو شیعرانەدا، سیستێمە بڕگەییەکە تێکدەچێت و هەمان ئاوازی (مۆسیقا)یی دەپارێزرێت، کە لەم لایەنەوە هەموو ئەو شیعرانە (موزاریعی ئەخرەب)ن.

(وەفایی) ئەو جۆرە لادانانەی لە سیستێمی بڕگەیی (هەنگاو)ە عەرووزییەکان زۆرە، ڕەنگە هۆی ئەو دیاردەیەش بۆ زاڵبوونی ڕەگەزی (ئاواز) بەسەر شیعرەکانیدا بگەڕێتەوە.

هەر لە دیوانەکەدا، ئەم شیعرەی خوارەوە بەرچاو دەکەوێت:

ئارەق ڕوی داگرتی لەبەر پێکەنینت
شەبنم لە گوڵ باری ڕۆژی گرت پەروینت

(ل: ٣٠)

کە (هێمن) لە بارەیەوە دەڵێت: (کێشی ئەم غەزەلە وا وێدەچێ ئیبداعی خۆی بێ لە دیوانی هیچ شاعیرێکی کورد دا کێشی وام نەدیوەو وە بیرم نایە لە شیعری فارسیش دا وێنەم دیبێ» (پەراوێزی هەمان لاپەڕە).

گومانی تێدا نییە (هێمن) تەنیا سەرنجی چەندێتیی ڕووتی بڕگەکانی داوە، لە کاتێکدا خوێندەوەی ڕیتمی بەڕوونی دەردەخات. (وەفایی) لە هۆنینەوەی ئەو شیعرەدا، وەکو (گۆران) لە (جوانی بێ ناو)دا-



بەنموونە- بەئاگادارییەوە لە دەوری (مۆسیقا)ی کێشی (موتەقاریب) و (موتەدارەک)دا دەخولێتەوە. لە ڕاستیدا لیستەی ئەو جۆرە سنوور تێکەڵکردنە لە ڕەخنەی کوردیدا زۆر درێژە. (کاکەی فەللاح) لە (کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەرگی یەکەم، بەغدا، ١٩٨٠)دا گەلێ تاقیکردنەوەی لەو بابەتەی ئەنجام داوە. بەنموونە ئەم شیعرەی (دیلان)ی بەکێشی خۆماڵی داناوە:

دیسانەوە نەورۆزە، بەهارە، گوڵی ئاڵە
شەونم بەقەتیسی لەسەر ئەو نێرگسە کاڵە
وەک چاوە چ چاوێ کە بەفرمێسک و کەژاڵە

(ل: ٢٢١)

کەچی شیعرەکە، لە کێش و لە ڕیتمیشدا (هەزەجی هەشت هەنگاویی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف)ە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| دیسانە | وەنەورۆزە | بەهارە گو | ڵی ئاڵە |
| شەونم بە | قەتیسی لە | سەرەو نێرگ | سە کاڵە |
| وەک چاوە | چ چاوێک کە | بەفرمێسک و | کەژاڵە |
| مەفعوولو | مەفاعییلو | مەفاعییلو | فەعوولون |

لە هەمان جێگادا، شیعری (مامە کوڕنوو)ی هەمان شاعیری بەکێشی (١٥) بڕگەیی داناوە، جگە لەوەی وەسفەکە ئاستی ڕووتی کێش دەگرێتەوە، شیعرەکە بەڕوونی دیارە (ڕەمەلی هەشت هەنگاویی مەحزوف)ە.

هەرچەن دەتوانین وتارەکەی (بیمار) لە (ڕۆشنبیری نوێ، ١١٣، ١٩٨٧)دا، بەهەوڵێکی تا ڕادەیەک سەرکەوتوو لەم لایەنەوە بژمێرین، لەگەڵ ئەوەشدا چ لە بواری کێشی عەرووز و چ لە بواری کێشی خۆماڵیدا، هەندێ بۆچوونی پێچەوانەش دەبینرێن.

(بیمار) لە سەرەتادا، وەکو ڕاهێنانێک بۆ دەسنیشانکردنی سروشتی

(تەفعیلە) عەرووزییەکان، (تەفعیلە)کانی ئەم نیوە دێڕەی (سالم)، کە تێهەڵکێشی نیوە دێڕێکی (حافز) کراوە:

مەی گەر حەرام و تاڵە ساقی بەچاوی مەستت
أشـــهـى لنا وأحلى من قُـــبلة العـــذارى

بەم جۆرە نووسیوە: (مستفعلن/ فعولن/ مستفعلن/ فعولن)، لە کاتێکدا هیچ کێشێکی باوی عەرووزی ئەو تەفعیلانەی نییە و هەردوو دێڕەکە بەکێشی (موزاریعی ئەخرەب = مەفعوولون/ فاعیلاتون/ مەفعوولو/ فاعیلاتون) هۆنراونەتەوە. بڕوانە: دیوان حافظ، خلخالی، تهران، ١٣٠٦ هجری، ص ٧.

هەروا شیعرێکی (بێخود) کە (شێخ نووری) لە وتارەکەیدا بە(موجتەسسی مەخبوون)ی داناوە، ئەم بە(هەزەجی سالیم)ی پۆلینکردووە، سەرچاوەی شیعرەکەشی نەک وتارەکەی (شێخ نووری)، بەڵکو کتێبەکەی (د. بەسیر- شێخ نووری لە کۆڕی لێکۆڵینەوەی وێژەیی و ڕەخنەسازیدا، بەغدا، ١٩٨٠) یە، سەرچاوەی نادروستیکەش هەر لێرەوەیە؛ چونکە وشەی کۆتایی شیعرەکە (جینانم)ە نەکو (جەنناتم). کەواتە کێشی شیعرەکە هەر ئەوەیە وا (شێخ نووری) دیاریکردووە.

لە ڕاستیدا سنووری نێوان ئاستەکانی (کێش) و (ڕیتم) لە زەینی (بیمار)ەوە ئەگەر جێگای دوو (تەفعیلە)ی عەرووزی ئاڵوگۆڕ بکەین «دەبینین ڕیزکردن و بەرودواهاتنی بڕگەی کورت و درێژ تێک دەچێت، ئەوسا کێش و سەنگی شیعرەکە لەنگ دەبێت... هتد ل ١٦٦» لە کاتێکدا ئەو کارە کێش و سەنگی (تەفعیلە)کان لەنگ ناکات؛ چونکە دوو (تەفعیلە)ی وەکو (مستفعلن- فاعلاتن) هەرچەندە لە ڕیزبوونی بڕگەییدا وەکو یەکتر نین، بەڵام هەردووکیان لە هەمان جۆر و ژمارەی بڕگە پێکهاتوون: (بڕگەیەکی کورت و سێ بڕگەی درێژ)، ئەو کارە سەر بەئاستی ڕیتمە نەکو کێش.



هەر لەم زەمینەیەوە، کاتێک دێتە سەر ڕەتکردنەوەی بۆچوونەکانی (تیلی ئەمین)، کە (مەم وزین)ەکەی (خانی)ی بەکێشی خۆماڵی پۆلینکردووە، جیاوازییەکی بنەچەییمان لەنێوان ئەو دوو کێشەدا پیشان نادات.

(بیمار) لە بۆچوونێکی دروستی تیۆریی وەکو «ژمارەی بڕگە مەرجی کێش و مۆسیقا نییە: ل ١٦٩»، ناتوانێت بەراووردکردنێکی سەرکەوتووی ڕیتمی لەنێوان شیعری (١٠) بڕگەیی خۆماڵی و جۆرە عەرووزییە هاوبڕگەکانی، بەئەنجام بگەیەنێت.ئەو پێوەری (بیمار) بۆ جیاکردنەوەی ئەو دوو جۆرە شیعرە دیاری دەکات: (١٠) بڕگە لە نیوە دێڕی شیعر و وەستان لە ناوەڕاستیاندا: (٥+٥)، بەهیچ جۆرێک ڕێگا لە بەیەکدا چوونی کێشی عەرووز و خۆماڵی ناگرێت. لە ڕاستیشدا گەلێ لەو نموونانەی (تیلی ئەمین) بۆ بەرگریکردن لە بۆچوونەکەی خۆی پشتی پێبەستوون، وەستان لە ناوەڕاستیاندایە: (ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١٠٩)، ١٩٨٦، نموونەکانی: ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧، ٨، ل- ١٤٦).

لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی شیکردنەوەکانی کەرتی (٢- ٤) سەلماندیان و لێرەدا دووپات دەکرێنەوە: هەر هەوڵدانێک بۆ کۆکردنەوەی بڕگەکانی دێڕە شیعرێکی فۆلکلۆری لە دەستەی هاوژمارەدا، (مۆسیقا)ی شیعرەکە لە یەکێک لە کێشە پێوانەییەکان نزیک دەکاتەوە. ئەو کارە، شیعرەکە بەتەواوی دەباتە خانەی ئەو کێشانەوە، ئەگەریش ئەو دیاردەیە لەسەر تا سەری شیعرەکەدا پێڕەویی لێ کرا، دەقەکە قەوارەی سەربەخۆی نامێنێت.

کەواتە بۆ دەسنیشانکردنێکی دروستی شیعرێکی (١٠) بڕگەیی خۆماڵی - بەنموونە- لە پێشدا مۆرفیمە واتادارەکان جیا دەکرێنەوە، کە بەزۆری (٢، ٣) بڕگەیین، ئەوجا ستریسێکی سەرەکیی (واتا)، لەسەر هەر بەشێکیان دادەنرێت، وەکو لە (پا- ١- ٦)دا دیاریکراوە.

ئێستا هەوڵ دەدەین بەراووردێکی ڕیتمی (لە نێوان (٤) نموونە

شیعری (١٠) بڕگەیی کوردیدا، بەمەبەستی دیاریکردنی بنیاتە ڕیتمییە ڕاستەقینەکانیان، ئەنجام بدەین:

(ئەلف خێ)

| (اخضر) چ کەسکە | (احمر) خوسورە | (ازرق) هشینە | (جورب) چ گۆرە |
|---|---|---|---|
| – – ٮ – – | – – ٮ – – | – – ٮ – – | – – ٮ – – |

(نوبهارا خانی، ل ٤٧)

(حێ قاف)

| لەولاوە ئەوان | بەحیلەبازی | لەم لاوە ئەمان | بەتەقڵەبازی |
|---|---|---|---|
| – – ٮ ٮ – | – ٮ – ٮ – – | – – ٮ ٮ – | – ٮ – ٮ – – |

(دیوانی حاجی قادر، ل ٢٠٠)

(زێ واو)

| تورک ئەڵێ قەبری | کوردە ئەو شاخە | بام بڵێ چونکە | باتینەن باخە |
|---|---|---|---|
| – ٮ – – ٮ | – ٮ – – – | – ٮ – – ٮ | – ٮ – – – |

(دیوانی زێوەر، ل ١٧)

(میم لام)

| پەژارەت شادیم | جە بێخ ئاوەردەن | دووریت ڕیشەی دڵ | خەیمەکەن کەردەن |
|---|---|---|---|
| – ٮ – – – – | ٮ – – – – | – – – – – | – ٮ – – – |

(دیوانی مەولەوی، ل ١٠٨)

ئەگەر لە ئاستی کێشەوە لە هەر (٤) نموونەکە بڕوانین، دەبینین هەر چواریان لە (١٠) بڕگە لەهەر نیوە دێڕێکدا پێکهاتوون.

لە ئاستی ڕیتمیشدا هەر خوێندنەوەیەکی ئاسایی، هەر یەکێک لە نیوە دێڕەکان بەسەر دوو دەستەی (٥) بڕگەییدا دابەش دەکات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت نموونەکان لە کێش و بنیاتی ڕیتمیشدا چوونیەکن. بەڵام نزیکبوونەوەیەکی پتر لە سیستێمی (مۆسیقا)یی نموونەکان لە چوارچێوەی هۆنراوەکانیاندا، وێنەیەکی ڕوونترمان پێشان دەدات.

با لە نموونە (میم لام) ەوە دەست پێبکەین. وەکو دەبینین نموونەکە



دێڕە شیعرێکی (مەولەوی)یە و گومان لەوەدانییە ڕیتمێکی خۆماڵیی هەیە.

با ئێستا پرسیارێکی سادە، بەڵام زۆر گرنگ ئاراستە بکەین: چ جیاوازییەک لەنێوان نموونە (میم لام) و ئەو دوای نموونەکانی دیکەدا هەیە؟

ئەگەر وەڵامەکەمان هەر ئەوەندە بێت نموونە (میم لام) شیعرێکی (١٠) بڕگەییە و وەستان لە نێوە ڕاستیدایە (٥+٥) و سیستێمی جووت قافیەی هەیە، ئەوا ئەو دوای نموونەکانی دیکەش ئەو سێ مەرجانەیان تێدایە.

کەواتە نموونە (میم لام)، بۆ ئەوەی کەسایەتیی خۆی بسەلمێنێت، پێویستە هەوڵی تێکدانی سیستێمی نموونەکانی دیکە بدات.

بەرامبەر بەو نارێکییەی لە دەستە دەنگییەکانی (میم لام)دا هەیە، دەستە دەنگییەکانی نموونە (زێ واو) ڕێکییەک پێشان دەدەن کە بەگۆڕینی جێگای وەستانەکانی نێوانیان، سیستێمیک پێک دەهێنن لە عەرووزی نەتەوە نا عەرەبەکاندا بەکێشی (خەفیفی شەش هەنگاویی مەخبوونی ئەسلەم) ناسراوە:

(زێ واو)

| تورک ئەڵێ قەبـ | ری کوردە ئەو | شاخە |
|---|---|---|
| بام بڵێ چون | کە باتی نەن | باخە |
| – ب – – | ب – ب – | – – |
| فاعیلاتون | موفاعیلون | فەعلون |

بەو شێوەیە، نموونە (میم لام) یەکێک لە نەیارەکانی وەلادەنێت و سیستێمی (٥+٥)ی خۆی دەپارێزێت.

بەکارهێنانی هەمان چەکی عەرووزی لەگەڵ نموونە (حێ قاف)دا، سەرکەوتنێکی گەشتر بەدەست دەهێنێت:

(حێ قاف ١)

| | | |
|---|---|---|
| لەولاوە | ئەوان بەحیـ | لەباری |
| لەم لاوە | ئەمان بەتەق | لّەبازی |
| – ب – – | ب – ب – | – – |
| مەفعوولو | مەفاعیلون | فەعوولون |

کە بریتییە لەکێشی (هەزەجی شەش هەنگاویی ئەخرەبی مەقبووزی مەحزووف). ئێستا تەنیا نموونە (ئەلف خێ) ماوەتەوە کە دەبێ بەیەکێک لەم دوو ڕێگایە، لەگەڵ نموونە (میم لام)دا ڕێک بکەوێت: یان وەکو کێشێکی عەرووزی- وەکو نموونەکانی دیکە - خۆی لێ جیا کاتەوە، یان دەبێ وەکو هاوڕەگەزێک خۆی پێ بناسێنێت. بەڵام لەوە ناچێت نموونە (ئەلف خێ) لەگەڵ هیچ بارێکیدا بگونجێت.

وەکو کێشێکی عەرووزی دەتوانێت خۆی پێشکەش بکات، بەڵام بێ ئەوەی واز لەو سیستێمە بهێنت کە نموونە (میم لام) بەئەدگاری تایبەتیی خۆی دەزانێت:

(ئەلف خێ ١)

| | |
|---|---|
| (أخضر) چ کەسکە | (أحمر) خۆسورە |
| (أرزق) هیشیە | (جورب) چ گۆرە |
| – – ب – – | – – ں – – |
| موستەفعیلاتون | موستەفعیلاتون |

کە کێشی (ڕەجەزی مورەفـفەل)ە و هیچ دابەشکردنێکی دیکە هەڵناگرێت، هەر لێرەشەوە ناتوانێت وەکو هاوڕەگەزێکی نموونە (میم لام) خۆی بناسێنێت، هەرچەندە هەمان سیستێمی ڕیتمیشی هەیە.

ئەو بەرەنگارییە ڕیتمییە، چەند کێشێکی دیکەی عەرووزیی وەکو (مەجزووئی وافیر- موفاعەلەتون// موفاعەلەتون) و(مەجزووئی کامیل



= موتەفاعیلون// موتەفاعیلون)یش پیشانی دەدەن.

بەوشێوەیە، پاش هەموو ئەو هەوڵانە، بۆمان دەردەکەوێت هێشتا بە دەوری پرسیارەکەی پێشوودا دەخولێینەوە. کەواتە پێویستە ئەندازەی پێوەرەکان پلەیەکی دیکە نزیکترکەینەوە.

ئەگەر سەرنجی (هەنگاو)ەکانی نموونە (ئەلف خێ) بدەین، دەبینین هەر یەکەیان لە (تەفعیلە)یەکی (موستەفعیلون) پێکهاتووە کە بەهۆی (عییلە)ی (تەرفیل = زیادکردنی سەبەبێکی سووک بۆ هەر تەفعیلەیەک کۆتایی بەوەتەدێکی کۆ هاتبێت) بووە بە(موستەفعیلاتون).

وەکو زانیمان، لە هەر (تەفعیلە)یەکی عەرووزیدا (وەتەد)ێک هەیە نووکە ڕیتمییەکەی دروست دەکات. کەواتە دەتوانین ناوکە ڕیتمییەکانی نموونە (ئەلف خێ) بەم شێوەیەی خوارەوە دەسنیشان بکەین:

(ئەلف خێ ٢)

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| موسـ | تەف | عیلا | تون | موسـ | تەف | عیلا | تون |
| أخ | ضر | چ کەسـ | کە | أحـ | مر | حوسو | رە |
| أز | رق | هشیـ | نە | جو | رب | چ گۆ | رە |

ئێستا ئەگەر بمانەوێ سترێسێکی سەرەکی بۆ هەر یەکێک لە (تەفعیلە)کان دابنێین، دەبێ لەسەر ڤاوڵی درێژی (وەتەد)ەکان دایان بنێین کە لە شیعرەکەدا بەم شێوەی خوارەوە دەردەکەوێت:

(ئەلف خی ٣)

| | |
|---|---|
| (اخضر) چ کەسکە | (احمر) خوسورە |
| (ازرق) هشینە | (جورب) چ گۆرە |

بۆ ئەوەی بتوانین بنیاتی ڕیتمیی نموونە (میم لام)یش دیاری بکەین، پێویستە سەرەتا بنیاتی سینتا- سیمانتیی شیعرەکە دەسنیشان بکرێت.

نیـوە دێڕەکـانی نموونەکـە لەو ڕووەوە، لەو جـۆرەن کە (واتا)کـانیـان لە سنووری خـۆیاندا تەواو دەبن، کـەواتە دەسـتـە دەنگیی یەکـەمی نیـوە دێڕەکـان شـێـوازێکی (پرسـیـار) یان دەبێت و و دەسـتـە دەنگیی دووەم شێوازێکی (وەڵام):

(میم لام ١)

پەژارەت /↖/ شادیم /↙/ جەبێخ /↖/ ئاوەردەن /↙/
دووریت / ↖/ ڕیشەی دڵ / ↙/ خەیمەکەن / ↖/ کەردەن / ↙/

بە گـوڕینەوەی پلە ئاوازەییـیـەکـان بە پلەی سـترێسی سـەرەکی، ئەم داڕشتنەی خوارەمان دەست دەکەوێت:

(میم لام ٢)

پەژارەت شادیم جەبێخ ئاوەردەن
دووریت ڕیشەی دڵ خەیمەکەن کەردەن

بەو شـێـوەیە ڕوون دەبێـتـەوە جـیـاوازیی نێـوان بنیـاتی ڕیتم لە کێـشی خۆماڵی و کێشی عەرووزیدا، سیسـتێمی (وەستان)ەکان نییە کە لە هەردوو نموونەکـەدا چونیـەک بوو، بەڵکو لە ژمـارەی ئەو مـەڵبـەندە ڕیتـمییـانەدایە هەر یەکـێکیـان لێـیـان پێکدێن. کـەواتە بەرامـبـەر دوو مەڵبەندی ڕیتـمی لە نموونە (ئەلف خی ٣)دا، نموونە (میم لام ٢) چوار مـەڵبـەندی ڕیتـمی تێـدایە کـە بەهەندێ دەسـتکارییـەوە لە ڕیتـمی (مـوتەقـاریبی هەشت هەنگاویی ئەسلەم= فـەع لون/ فـەعـوولون/ فـەع لون/ فــەعــوولون) نـزیک دەبێــتــەوە. (بڕوانە دیوانی زێوەر- ل١١٩، شیعری: بلبل بەنەغمەی دڵکێش و خۆش). هەرچەندە پتر هەمان ڕیتمی (ڕەجەزی مورەففەل)ی هەیە. بڕوانە (دیوانا مـەلایێ جزیری- ل١٥١، شیعری ژمارە «٧»).



**پاشکۆی ژمارە (٣)**

کێشە عەرووزییەکانی شیعری کلاسیکی کوردی

جگە لە وتارەکـەی (هەردی)، گـەلێ وتاری دیکە هەن باسی جۆرێک، یان پـتـری ئەو کـێـشـە عـەرووزییـانەیان کـردووە کـە لەشـیـعـری کـوردیدا بەکـارهێنـراون. لەم بوارەدا دەتوانرێت ئاماژە بۆ وتارەکەی (عەبدولڕەزاق بیمـار) بکرێت: (سێ کێشی عەرووز لە هەڵبەستی کوردیدا، ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١١٠)، ١٩٨٦) کە باسی کێشەکانی (مـوزاریع، موتەقاریب، خـەفیف) و چەند وێنەیەکـیـانی کـردووە، هەرچەندە شـیـعـرێکی (حـاجی قـادر= فـەلەک بەتیـروکـەمـانی... هتـد) و شـیـعـرێکی (مـەلای کـۆیە= شۆڕەژن من... هتد).

بە (موزاریع) و (خەفیف) داناوە و لە ڕاستیدا وەکو (هەردی) ڕوونی کردۆتەوە (موجتەسس) و (ڕەمەل)ن. «کاروان، ژ (٥٢)، ١٩٨٧».

یەکـەمین ئامـاژەکـردن بۆ ئەو بابەتە، لە وتارێکی (شـێخ نووری) لە «ژیان، ژ (٣١)، ١٩٢٦»دا بەرچاو دەکـەوێت. لە ڕاسـتـیـشـدا، فـراوانـتـرین ئاوڕدانەوەیە کـە هەوڵەکـانی دواتر بەدەگـمـەن لێـیـان زیاد کـردووە. (شـێخ نووری) لەو وتارەدا (تەفـعـیلە)کـانی (٩) کـێـشی عەرووزیی بێ ناوهێنانی کێشەکانیان، دیاریکردووە.

بەڵام لە دەسنووسی (سـەنعەت و سـەنایعی نەفـیسـە)دا، ئامـاژەی بۆ (٣) کێشی دیکەش کردووە کە لە وتارەکەدا بڵاو نەکراونەتەوە. ڕەنگە یەکێک لە هۆکـان، ئەو ڕوونکردنەوە عـەرووزییـانە بێت هەندێ لە نموونە شیعرییەکان پێویستیان بێت بۆ ئەوەی لەگەڵ کێشەکاندا ڕێک بکەون، ئەمە جگە لەوەی خوێشی ناوی (هەنگاو)ی چەند کێشێکی بەدروستی دەسنیشان نەکردووە. بەنموونە، لە دێڕە شیعری:

وا لە خـــراباتی غـــما کـــوتوم
بگرە دستم توبی خدا أی صنم (ل: ١٨)

(تەفعیلە)کانی بەم جۆرە نووسیوە: (متفعلن مفتعلن فاعل).

هەرچەند (شێخ نووری) ناوی کێشەکەی دیاری نەکردووە، بەڵام (سەریعی شەش هەنگاویی مەتویی مەکشووف)ە و پاش دەستکاریی ڕێنووس و داڕشتنەکەی، بەم جۆرەی خوارەوە شی دەکرێتەوە:

| وا لە خەرا | باتی غەما | کەوتووم |
| --- | --- | --- |
| بگرە دەسم | توبی خودا | ئەی صەنەم |
| موفتەعیلون | موفتەعیلون | فاعیلون |

یان لە نموونەی: (شەو پەشێو و سەودایی توڕەیی تۆم: ل١٨)دا، (تەفعیلە)ی دوایی بە(فعلن) داناوە، کە لە ڕاستیدا (مەخبوونی مەقسوور= فاعیلان)ە. لە نموونەی: (چاوەکەم تۆ کە گوڵی گوڵزاری: هەمان لاپەڕە)شدا، (تەفعیلە)ی دوایی بە(فعلات) داناوە، لە کاتێکدا (ئەسڵەم= فع لن= فەع لون)ە.

لەو جۆرە ئاڵوگۆڕکردنانە لە نموونەکانی دەسنووسەکەدا زۆرن، هەر چەندە هەندێکیشیان بۆ شێوەی ڕێنووس دەگەڕێنەوە. لە ڕاستیدا ئەم لایەنە گرنگەی هەوڵەکانی (شێخ نووری) پێویستییان بەلێکۆڵینەوەی سەر بەخۆیە.

هەرچۆنێک بێت، وا بۆ سوودی باسەکە، ئەنجامی ئەو ئەژمارە بڵاو دەکەینەوە کە بەشێکە لە پرۆژەی کارێکی سەربەخۆ لە بارەی شیعری عەرووزیی کوردییەوە. بەڵام پێویستە چەند تێبینییەک لەو بارەیەوە تۆمار بکرێن:

١- ئەژمارەکە تەنیا بۆ شیعری ئەو (٢٣) دیوانە کراوە کە لە کتێبخانەکەی (د. خەزنەدار)دا لەبەر دەستدابوون و بەپێشنیازی ئەو هەڵبژێراون.

٢- لە ئاستی هەر کێشێکدا، نیشانەیەک بۆ ئەو کەسە دانراوە کە لە بەرهەمێکی تایبەتیدا ئاماژەی بۆ کێشەکە کردووە، نیشانەکانیش



ئەمانەن:

(ش): شێخ نووری- لە وتارەکە و دەسنووسەکەیدا، کێشەکانیش بەگوێرەی نموونە شیعرییەکان دا دەنێین نەکو بەگوێرەی (تەفعیلە)کانی نووسەر.

(س): سەججادی- لە (نرخ شناسی)دا.

(هـ): هەردی- لە (برایەتی) و (کاروان)دا.

(ئـ): ئیحسان فوئاد- لە (گۆڤاری کولێجی ئەدەبیات)دا.

(ب): بیمار- لە (ڕۆشنبیری نوێ)دا.

٣- لە بارەی کێشی (تەویل) و (کامیل)ەوە، بۆ هەر یەکێکیان لە نموونەیەک پترمان لە دیوانەکاندا بەرچاو نەکەوت. دیارە ئەو دیاردەیە لە شیعری کوردیدا شتێکی سەیر نییە؛ چونکە ئەو دوو کێشە پتر تایبەت بەشیعری عەرەبین. بەگوێرەی ئەو ژمارەی (د. ئەمین عەبدوڵڵا) بۆ هەندێ لە شیعرەکانی سەردەمی (جاهیلی و سەدری ئیسلام)ی کردوون، کێشی (تەویل) و (کامیل) بەزنجیرە لە پلەی یەکەم و دووەمدا هاتوون (عروض الشعر العربي، القاهرە، ط ١، ١٩٨٥، ص، ٢٩) نموونەکان ئەمانەن:

(ئەلف) کێشی تەویل:

دەروونی لیداریششارە زووری وە بەردیهی
کە فرمێسکی گەرمیهی ئیلا ئاوی سەردیهی

ئەم شیعرەی (نالی)، (بیمار) ئاماژەی بۆ کردووە، بەڵام ئەو ناو و جۆری کێشەکەی تۆمار نەکردووە. سەرەڕای ئەوەش، (هەنگاو)ی (مەفاعیلون)ی بە دوو (وەتەدی کۆمەل) داناوە، کەچی وەکو زانراوە هیچ (هەنگاو)ێکی عەرووزی لە (وەتەد)ێک پتری تێدا نییە. لە ڕاستیشدا (هەنگاو)ەکە (مەفاعیلون)ە و لە (وەتەد)ێکی کۆ و دوو (سەبەب)ی سووک پێکهاتووە: (//ە- /ە- /ە)، بەڵام بەهۆی

(زیحاف)ی (قەبز)ەوە نەبزواوی (سەبەب)ی یەکەمی لەناوچووە و بووە بە(مەفاعیلون= //ە- /- /ە).

شیعرەکەش (تەویلی هەشت هەنگاویی عەرووز و زەربی مەقبووز)ە و ئەمە شیکردنەوەکەیەتی:

| دەروون | لیدرایششا | رەزووری | وەبەدیهی |
|---|---|---|---|
| کەفرمێس | کی گەرمیهی | ئیلائا | وی سەردیهی |
| فەعوولوون | مەفاعییلون | فەعوولون | مەفاعیلون |

بڕوانە: ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١١٣).

(بێ) کێشی کامیل:

ئەمە بۆی نەسیمی بەهارە، یا خەبەری سرووشی هەوایییە دەمی ڕووحبەخشی نیگارە، یا نەفەسی مەسیحی سەمایییە (شێخ نووری) لە دەسنوسەکەیدا، نموونەیەکی لەو شیعرە هێناوەتەوە و (تەفعیلە)کانی دەسنیشان کردووە. بەڵام (محەمەدی مەلا کەریم) لە (دیوانی بێخود)دا، شیعرەکەی بەجۆرێک نووسیوە خوێندنەوەیەکی (مۆسیقا)یی جیا لە کێشەکەی دەسەپێنێت. لە ڕاستیدا نەدەبوو چوکڵە (،) لە نێو (میسرەع)ەکاندا دابنێت.

شیعرەکە (کامیلی هەشت هەنگاویی سالیم)ە و لەتکردنیشی بەم جۆرەیە:

| ئەمە بۆی نەسیـ | می بەهارەیا | خەبەری سروو | شی هەواییەیە |
|---|---|---|---|
| دەمی ڕووح بەخـ | شی نیگارە یا | نەفەسی مەسیـ | حی سەماییەیە |
| موتە فاعیلون | موتەفاعیلون | موتەفاعیلون | موتەفاعیلون |

بڕوانە: دیوانی بێخود، ل: ١٠٣.

تێبینییەک لەبارەی نێوەرۆکی خشتەکانەوە:

جگە لەو زانیارییانەی بەکەڵکی هەڵسەنگاندنێکی قووڵتری شیعری



عەرووزیی کوردی دێن، خشتەکان زەمینەیەکی لەبار بۆ بەراووردکردنی ئاستەکانی کێش و ڕیتم لە شیعری عەرووزی و خۆماڵیی کوردیدا تەخت دەکەن؛ چونکە جۆرەکان لە هەموو ژمارە بڕگەکانی (٧ تا ١٦) یان تێدایە.

### خشتەی (پا- ١)

### ڕێژەی سەدیی ئەو کێشە عەروزییانەی لە شیعری کلاسیی کوردیدا بەکارهێنراون(*)(**)

| ز | کێشەکان | ڕێژەکانیان |
|---|---|---|
| ١ | هەزەج | ٪٤٩ |
| ٢ | ڕەمەل | ٪٣٥,٩ |
| ٣ | موزاریع | ٪٧,٤ |
| ٤ | ڕەجەز | ٪٣,١٩ |
| ٥ | خەفیف | ٪٢,٠٢ |
| ٦ | موجتەسس | ٪٠,٨ |
| ٧ | موتەقاریب | ٪٠,٥ |
| ٨ | بەسیت | ٪٠,٦٧ |
| ٩ | سەریع | ٪٠,٢١ |
| ١٠ | مونسەریح | ٪٠,١٦ |

(*) ژمارەی نزیکەیی شیعرەکان، (٢٣٧٦) غەزەل و قەسیدەیە.

(**) هەردوو نموونەکەی (تەویل) و (کامیل)یش، لە سنووری ڕێژەیی خشتەکەدان.



### خشتەی (پا- ٢)

### جۆرەکانی (هەزەج) لە شیعری کلاسیی کوردیدا(*)

| ز | جۆرەکان | باسکراوەکان |
|---|---|---|
| ١ | (٨) هەنگاویی سالیم | (ش) (هـ) (ئـ) |
| ٢ | (٨)ی موسەببەغ | |
| ٣ | (٨)ی مەحزووف | |
| ٤ | (٨)ی مەقسوور | |
| ٥ | (٨)ی ئەخرەب | (هـ) |
| ٦ | (٨) ئەخرەبی مەکفووفی موسەببەغ | |
| ٧ | (٨) ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف | (ش) |
| ٨ | (٨) ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور | (ش) |
| ٩ | (٨) ئەخرەبی مەکفووفی مەجبووب | |
| ١٠ | (٨) ئەخرەبی مەقبووزی مەکفووفی مەجبووب | |
| ١١ | (٦)ی مەحزووف | (ش) (هـ) – |
| ١٢ | (٦)ی مەقسوور | |
| ١٣ | (٦)ی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور | |
| ١٤ | (٦)ی ئەخرەبی مەقبووزی مەحزووف | (ش) |
| ١٥ | (٦)ی ئەخرەبی مەقبووزی مەقسوور | |
| ١٦ | (٦)ی سەلیم | |

(*) لە ریزکردنی جۆرەکان، لەم خشتەیە و خشتەکانی پاشتریشدا، تەنیا ژمارەی (هەنگاو)ەکان ڕەچاو کراوە.

خشتەی (پا- ٣)

جۆرەکانی (ڕەمەل) لە شیعری کلاسی کوردیدا

| ز | جۆرەکان | باسکراوەکان |
|---|---|---|
| ١ | (٨) هەنگاویی مەحزووف | (ش) (هـ) |
| ٢ | (٨)ی مەقسوور | (س) (ئـ) |
| ٣ | (٨)ی مەخبوون | |
| ٤ | (٨)ی ئەسڵەم (اصلم) | |
| ٥ | (٨)ی مەشکوول | |
| ٦ | (٨)ی مەخبوونی مەقسوور | |
| ٧ | (٨)ی مەخبوونی مەحزووف | (ش) |
| ٨ | (٨)ی مەخبوونی ئەسڵەم | |
| ٩ | (٨)ی مەخبوونی ئەسڵەمی موسەببەغ | |
| ١٠ | (٨)ی مەجحووفی موسەببەغ | |
| ١١ | (٦)ی مەحزووف | |
| ١٢ | (٦)ی مەقسوور | |
| ١٣ | (٦)ی مەخبوون | |
| ١٤ | (٦)ی مەخبوونی ئەسڵەم | |
| ١٥ | (٦)ی مەخبنی مەقسوور | (ش) |
| ١٦ | (٦)ی مەخبوونی مەحزووف | |
| ١٧ | (٦)ی مەخبوونی ئەسڵەمی موسەببەغ | |
| ١٨ | (٤)ی سالم | |
| ١٩ | (٤)ی مەحزووف | |



خشتەی (پا- ٤)

جۆرەکانی (موزاریع) لە شیعری کلاسیی کوردیدا

| ز | جۆرەکان | باسکراوەکان |
|---|---|---|
| ١ | (٨)ی ئەخرەب | (ش) (بـ) |
| ٢ | (٨)ی ئەخرەبی موسبەبەغ | |
| ٣ | (٨)ی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف | (ش) (هـ) (ب) |
| ٤ | (٨)ی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور | |

خشتەی (پا- ٥)

جۆرەکانی (ڕەجەز) لە شیعری کلاسیی کوردیدا

| ز | جۆرەکان | باسکراوەکان |
|---|---|---|
| ١ | (٨)ی سالیم | |
| ٢ | (٨)ی موزال | |
| ٣ | (٨)ی مەخبوون | (ش) |
| ٤ | (٨)ی مەخبوونی موزال | |
| ٥ | (٨)ی مەتویی مەخبوون | |
| ٦ | (٨) ی مەتویی مەخبوونی موزال | |
| ٧ | (٦)ی سالیم | |
| ٨ | (٤)ی سالیم | |
| ٩ | (٤)ی مەخبوون | |
| ١٠ | (٤)ی مورەففەل | (ش) |

خشتەی (پا- ٦)

جۆرەکانی (خەفیف) لە شیعری کلاسیی کوردیدا

| ز | جۆرەکان | باسکراوەکان |
| --- | --- | --- |
| ١ | (٦)ی مەخبوونی مەحزووف | |
| ٢ | (٦)ی مخبوونی مەقسوور | (ش) (ب) |
| ٣ | (٦)ی مەخبوونی ئەسلەم | (ب) |
| ٤ | (٦)ی مەخبوونی مەربووع | |
| ٥ | (٦)ی مەخبوونی ئەسلەمی موسەببەغ | |

خشتەی (پا- ٧)

جۆرەکانی (موجتەسس) لە شیعری کلاسیی کوردیدا

| ز | جۆرەکان | باسکراوەکان |
| --- | --- | --- |
| ١ | (٨)ی مەخبوون | (ش) |
| ٢ | (٨)ی مخبوونی مەحزووف | (هـ) |
| ٣ | (٨)ی مەخبوونی ئەسلەم | (ش) |
| ٤ | (٨)ی مەخبوونی مەقسوور | (س) |
| ٥ | (٨)ی مەخبوونی ئەسلەمی موسەببەغ | |

خشتەی (پا- ٨)

جۆرەکانی (موتەقاریب) لە شیعری کلاسیی کوردیدا

| ز | جۆرەکان | باسکراوەکان |
| --- | --- | --- |
| ١ | (٨)ی سالیم | (ش) |
| ٢ | (٨)ی مەحزووف | (ش) (ب) |
| ٣ | (٨)ی مەقسوور | (س) (ب) |
| ٤ | (٨)ی ئەسلەم (اثلم) | |



خشتەی (پا- ٩)

جۆرەکانی (بەسیت) لە شیعری کلاسیی کوردیدا

| ز | جۆرەکان | باسکراوەکان |
| --- | --- | --- |
| ١ | (٨)ی سالیم | |
| ٢ | (٨)ی مەتوی | |
| ٣ | (٨)ی مەخبوونی مەقتووع | |

خشتەی (پا- ١٠)

جۆرەکانی (سەریع) لە شیعری کلاسیی کوردیدا

| ز | جۆرەکان | باسکراوەکان |
| --- | --- | --- |
| ١ | (٦)ی مەتوی مەکشووف | (ش) |
| ٢ | (٦)ی مەتوی مەوقووف | |

باشكۆى ژماره (٤):

## الشعر التركي و وزن الهجاء والعروض

يتميز الشعر التركي بخاصية فريدة وهي وجود أوزان المقاطع الصوتية - الهجاء- المسمى بـ«هجه وزني».

تعتبر هذه الاوزان اوزانا قومية نابعة من صميم اللغة التركية وجدت منذ اقدم العصور ولا زالت تستعمل ليومنا هذا.

وتستعمل الاصابع لتقطيع المقاطع الصوتية اي لتقطيع الكلمة حسب التهجي ويسمى ايضا بـ «حساب الاصابع» لان الحروف التركية من حيث اللفظ تنقسم الى قسمين:

١- الحروف اللينة التي تترك عند تلفظها، رنة وهزة في الفم فسميت لينة وهي:

ب- ج- چ- د- گ- غ- ژ- ت- م- ن- ل- ر-

٢- الحروف الصلبة، ويخرج صدى هذه الحروف دفعة ولا تترك صدى لها. لذا سميت صلبة، وهي ما تبقى من الحروف التركية.

يستعمل في الشعر التركي «١٥» قالبا من اوزان المقاطع الصوتية مبتدئا من (٥) خمسة هجاء حتى (١٩) هجاء، فمثلا ان القصيدة التي نظمت من المصراع الذي يحتوي على (١٤) هجاء، يقال انه من قالب الهجاء ذي الاربعة عشر. وهكذا بالنسبة لبقية القوالب.

(إشارات أولية في الشعر التركي)



## الشعر التركماني وأوزانه

عبداللطيف بندر اوغلو

في ميدان الادب كثيرا ما نصادف خمس وست كلمات مسطرة، تكتب وتسمى شعرا لكن ما هو الشعر؟ الشعر ليس كلمات موزونة مقفاة فحسب انما الشعر هو ان يخلق الحماسة والاثارة، وان يكون كلمات مؤثرة عميقة لدفع الانسان الى التفكير ليحتل مكانا مؤثرا في القلوب.

ان الشعر لايمكن ان يظهر بضربة اصبع أو بهذيان، الشعر هو نتيجة وجود تفكير واحساس يقظ يظهر ثابتا، ويعتبر من أجمل قطعة أدبية ويجب ان يكون فيه المنطق الداخلي، لان المنطق الداخلي يظهر الاشياء مجسمة... ان الاطار الذي يعيش فيه الشعر اليوم هو بدخوله الى لب الحقيقة لتغيير وجه العالم(١).

ومن المعلوم بالنسبة للشعر ككل ان يحتوي على الوزن فالوزن يعتبر معيارا للشهر الذي يترنم، ولكل شعب من شعوب الارض لها شعرها وللشعر أوزانه. اما الشعر التركماني فيتميز عن بقية شعر الأمم بخاصية واحدة هي وجود (أوزان المقاطع الصوتية)المسماة،هجة وزني،.

حيث تعتبر هذه الاوزان أوزانا قومية نابعة من صميم لغتنا التركمانية. وفي اعتقادي ان أجداد التركمان عرفوا الشعر قبل معرفتهم الكتابة، حيث كان الشعر وسيلة لاظهار الاعجاب بالابطال ولبطولاتهم والتغني بجمال الطبيعة وللتقرب من الالهة. وكان الشعر في ذلك الوقت ينظم بهذه الاوزان، أوزان المقاطع الصوتية، الهجاء، ولازال الشاعر التركماني ليومنا هذا يستعمل الاصابع لتقطيع المقاطع الصوتية أي لتقطيع الكلمة حسب التهجي ويسمى أيضا بـ«حساب الاصابع»، لان الحروف التركمانية من حيث اللفظ تنقسم الى قسمين:

١- الحروف اللينة التي تترك عند تلفظها رنة وهزة في الفم لذا سميت لينة وهي ب- ج- چ- د- ك- غ- ز- ت- م- ن- ل- ر.

٢- الحروف الصلبة وتخرج صدى هذه الحروف دفعة ولا تترك صدى لها لذا سميت صلبة. وهي ما تبقى من الحروف.

يوجد في الشعر التركماني (١٥) قالبا من المقاطع الصوتية، مبتدئا من (٥) خمسة هجاء حتى (١٩) هجاء فمثلا ان القصيدة التي نظمت من المصراع الذي يحتوي على خمسة هجاء يقال انه من قالب الهجاء ذي الخمسة او ان القصيدة التي نظمت من المصراع الذي يحتوي على (١٤) هجاء يقال انه من قالب الهجاء ذي الاربعة عشر. وهكذا بالنسبة لبقية القوالب لكن القوالب ذات سبعة، ثمانية، و أحد عشر، وأربعة عشر هجاء كثيرة الاستعمال.

ويجب ان يكون تقطيع القصيدة بالنسبة لـ: قالب سبعة بهذا الشكل: ٤+ ٣= ٧ أو ٣+ ٤= ٧، قالب ثمانية بهذا الشكل: ٤+٤= ٨، قالب احد عشر بهذا الشكل: ٦+ ٥= ١١ أو ٤+٤+٣=١١ أو ٧+٣+١= ١١، قالب اربعة عشر بهذا الشكل: ٧+٧= ١٤

١) لنأخذ شعرا من قالب المقاطع الصوتية ذي سبعة هجاء.

ديگانی چوق يول اوزون
بر آغير يوك اوموزون

خيرالله كاظم

فيكون تقطيعها هكذا:

١ ٢ ٣ ٤ + ١ ٢ ٣
دیـ گا نی چوق يول او زون
بر آ غير يوك او مو زون

٢- قالب المقاطع الصوتية ذي ثمانية هجاء:

عراق بزم دولتميز
قانی جوشقون مللتمز

حسن كوثر[2]



١ ٢ ٣ ٤+ ١ ٢ ٣ ٤
عـ راق بـ زم دو ئـ تـ مز
قا نی جوشـ قون ملـ لـ تـ مز

٣- قالب المقاطع الصوتية ذي احد عشر هجاء:

يولجو يولون شرقه اوغرارسا يارين
الينده ظفردەن قوپان چيچكله
گوكلره دایانان قارلی داغلارك
آردیندان يوكسەلەن گونشی بكلاله

ناظم حكمت[3]

١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦ + ١ ٢ ٣ ٤ ٥
يولـ جو يو لون شر قه اوغـ رار سا يا رين
ا لينـ ده ظ فر دەن قو پان چي چكـ له
گوگـ لـ ره دا يا نان قار لی داغـ لا رك
آر دينـ دان يوكـ سه لەن كو نـ شي بكـ له

٤- قالب المقاطع الصوتية ذي اربعة عشر هجاء:

استى بر صيجاق روزگار يارالار اولدو درين
جوشتو ده كز ايجيمده صار صلينجه گمين

بندر اوغلو[4]

٦ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦ ٧+ ١ ٢ ٣ ٤ ٥ ٦ ٧
اسـ تى بر صيـ جاق روز گار يا را لار اول دو د رين
جوشـ تو ده كز ايـ چيمـ ده صار ص لينـ جه گ مين

مجلة (صوت الاتحاد)

**دوو تێبینی پێویست:**

لە چاپکردنی نامەکە بووبوومەوە، کە گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١٢٦)، ١٩٩٠) کەوتە دەستم، لە ڕاستیدا گۆڤارەکە دوو وتاری تێدایە نەدەبوو – ئەگەر بلاوبکرایەنەتەوە – ئەم نامەیە بیانبوێرێت:

١- وتارێکی نایابی (د. وریا عومەر ئەمین)ە بەناونیشانی (شەپۆلەکانی شیعری کوردی)یەوە، کە گەلێ زانیاریی بەنرخی لە بارەی ئاستە تیۆرییەکانی کێش بەگشتی و لە شیعری خۆماڵی و عەرووزی و ئازادی کوردیدا بەتایبەتی، تێدایە. بەڵام گەشترین لایەنی وتارەکە، لەو کۆمەڵە زاراوە کوردییە لە بارانەدا دەردەکەوێت لەبری هەندێ لە زاراوە باوەکانی ئەمڕۆدا پێشنیازی کردوون. بەڕاستی ئەگەر وتارەکەم لە کاتی خۆیدا ببینیایە، بێ دوو دڵی «گرێ، باڵی ڕاست، باڵی چەپ»م لەبری (هەنگاو- پێ، نیوە دێڕی یەکەم، نیوە دێڕی دووەم» بەکار دەهێنا.

٢- وتارەکەی (کامیل ژیر) بەناوی (بەرگری لە هەڵبەست)، هەرچەندە لە چوارچێوەی بۆچوونەکانی (کاروان)ی دەرنەچووە، بەڵام هەندێ بیروڕای لە بارەی تێکەڵکردنی کێشە عەرووزییەکان، بۆ دارشتنی دەقی شیعری گەلالە کردوون، دەهێنێت هەڵسەنگێندرێن، بەگشتیش بەجێن.



## سەرچاوەکان

بەکوردی

١- کتێب:

Gamila Galil, K’ilamed Gime’ ta K’urda, Moskva, 1965.

دیوانی سەلام، بەغدا، ١٩٥٨.

دیوانی گۆران، ب١، بەغدا، ١٩٨٠.

عەلائەدین سەجادی، نرخ شناسی، بەغدا، ١٩٧٠.

عیزەدین مستەفا ڕەسول، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چاپی دووەم، سلێمانی، ١٩٧٩.

غازی فاتیح وەیس، فۆنەتیک، چ١، بەغدا، ١٩٨٤.

کامیل بەسیر، ڕەخنەسازی، بەغدا، ١٩٨٣.

کوردستان موکریانی، سینتاکسی ڕستەی سادە، بەغدا، ١٩٨٦.

محەمەد کەریم شەریف، سوارچاکی لە لاوکی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٨.

محەمەد مەعرووف فەتاح، زمانەوانی، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٧.

مەعرووف خەزنەدار، کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا، بەغدا، ١٩٦٢.

٢- گۆڤار:

برایەتی، ژمارە (١٠)، ١٩٧١.

بەیان، ژمارە (٥٧)، ١٩٧٩.

ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١١-١٩٨٦)، (١١٢-١٩٨٦)، (١١٥-١٩٨٧).

شەفەق، ژمارە (١)، (٢)، (١٠)، ١٩٥٨.

کاروان، ژمارە (٧٢)، (٧٦)، ١٩٨٩.

گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات، ژمارە (١٥)، بەغدا، ١٩٧٢.

هیوا، ژمارە (٣١)، ١٩٦١.

٣- ڕۆژنامە:

ژیان، ژمارە (٢٧)، (٢٨)، ١٩٢٦.

ژین، ژمارە (٢١)، (٢٣)، (٢٤)، ١٩٧١.

هاوکاری، ژمارە (٩٢٩)، ١٩٨٧.

٤- نامە:
دڵشاد علی محمد، بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا، ماجستێر، کۆلیجی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٨.
٥- دەستنووس:
شێخ نووری شێخ ساڵح، سەنعەت و سەنایعی نەفیسە، کتێبخانەی ئەوقاف، سلێمانی، ژمارە (٣٧٨٣).
گۆران، موحازەرەکانی کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغدا، ١٩٦١.

بەعەرەبی

١- کتێب:
أرسطو، الخطابة، ترجمة عبدالرحمن بدوى، بغداد، ١٩٨٠
أرسطو، فن الشعر، ترجمة عبدالرحمن بدوى، القاهرة، ١٩٥٣.
آرون كوبلاند، كيف نتذوق الموسيقى، ترجمة محمد رشاد، ط٣، القاهرة، ١٩٦١.
برتيل مالبرج، علم الاصوات، ترجمة عبدالصبور شاهين، القاهرة، ١٩٨٥.
تزفيتان تودوروف، نقد النقد، ترجمة سامي سويدان، ط ٢، بغداد، ١٩٨٦.
توفيق وهبي، قواعد اللغة الكردية، ج١، بغداد، ١٩٥٦.
تيغيم فان فيليب، المذاهب الادبية الكبرى في فرنسا، ترجمة فريد انطونيوس، ط٢، بيروت، ١٩٨٠.
جان جاك روسو، محاولة في اصل اللغات، ترجمة محمد محجوب، بغداد، ١٩٨٦.
جمهورية افلاطون، ترجمة حنا خباز، ط٢، بيروت، ١٩٨٠.
جيلفورد، ميادين علم النفس، ترجمة يوسف مراد، مج (، القاهرة، ١٩٥٥.
حسن الغرفي، البنية الايقاعية لشعر حميد سعيد، بغداد، ١٩٨٩.
رالف بيلز، مقدمة في الانثروبولوجيا العامة، ترجمة محمد محمود الجوهري، ج ٢، القاهرة، ١٩٧٧.
رتشاردز، مبادئ النقد الادبي، ترجمة مصطفى بدوى، القاهرة، ١٩٦٣.
رسالة الكندى، ترجمة يوسف شوقي، دار الكتب، ١٩٦٩.
رينيه ويليك، آوستن وارين، نظرية الادب، ترجمة محي الدين صبحي، ط ٢، بيروت، ١٩٨١.
سامى مهدى، افق الحداثة وحداثة النمط، بغداد، ١٩٨٨.



سوزان برنار، جمالية قصيدة النثر، ترجمة زهير مجيد مغامس، مطبعة الفنون، بغداد، بدون تأريخ.
صلاح فضل، نظرية البنائية في النقد الادبي، الطبعة الثالثة، بغداد، ١٩٨٧.
طه باقر، مقدمة في ادب العراق القديم، بغداد، ١٩٧٦.
عبداللطيف بندر اوغلو: اشارات اولية في الشعر التركي، بغداد، ١٩٨٣.
: قصائد مختارة من الشعر التركي الحديث، الكويت، ١٩٧٨.
عباس توفيق، نقد الشعر العربي الحديث في العراق، بغداد، ١٩٧٨.
الفارابى، الموسيقى الكبير، تحقيق غطاس خشبة القاهرة، ١٩٦٧.
فريزر، الوزن والقافية والشعر الحر، ترجمة عبدالواحد لؤلؤة، بغداد. ١٩٨٠.
فنسنت، نظرية الانواع الادبية، ترجمة حسن عون، المجلد الاول، الاسكندرية، بدون تأريخ.
كمال ابو ديب، في البنية الايقاعية للشعر العربي، الطبعة الثالثة، بغداد، ١٩٨٧.
محمد شفيق غربال، الموسوعة العربية الميسرة، دار الشعب، صورة من طبعة، ١٩٦٥.
محمد علي الخولي، الاصوات اللغوية، الطبعة الاولى، الرياض، ١٩٨٧
محمد العياشي، نظرية ايقاع الشعر العربي، تونس، ١٩٧٦.
محمد مندور، في الميزان الجديد، الطبعة الاولى، القاهرة، ١٩٤٤.
مختارات في الادب الافريقي، ترجمة علي شلش، بغداد، ١٩٨٦.
مصطفى حركات، كتاب العروض، الجزائر، ١٩٨٦.
المعرى، الفصول والغايات، تحقيق محمود حسن زناتي، ج ١، بيروت، ب ت.
هربرت ريد، حاضر الفن، ترجمة سمير علي، بغداد، ١٩٨٣.
٢- گۆڤار:
الاديب المعاصر، العدد (٤١)، ١٩٩٠.
الثقافة الاجنبية، العدد (١)، ١٩٨٨.
صوت الاتحاد، العدد (٣٩)، ١٩٨٦.
٣- ڕۆژنامە:
الثورة، العدد (٧٣٠٥)، ١٩٩٠.
الجمهورية، العدد (٧٥٨٤)، ١٩٩٠.

بەفارسی

پرویز ناتل خانلری، وزن شعر فارسی، چاپ سوم، تهران، ١٣٤٥.
پورداود، گاتها، جزو اول، بمبی، ١٩٢٧.
محمد مکری، گورانی یا ترانهای کوردی، تهران، ١٩٥١.

بەئینگلیزی

Academic American Encyclopedia- 16, New Jersy, 1981.
Abdul- Majeed, Rashid Ahmad, The phonemi system of modern standard Kurdish, Michigan, 1986.
Soane E. B., Kurdish Grammar, London, 1913.


**دوو تێبینی بیبلۆگرافی:**

یەکەم: بۆ ئەنجامدانی ئەژمارەکانی نامەکە و بۆچوون و شیکردنەوەکانی پەراوێز و پاشکۆکان، ئەم سەرچاوانەی خوارەوە بەکار هێنراون:


بەکوردی

١- کتێب:
ئەمینی ئوسمان، ژیان و ڤیان، بەغدا، ١٩٨٦.
ئەورەحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا، بەغدا، ١٩٧٦.
عوسمان شارباژێڕی، گەنجینەی گۆرانی کوردی، بەغدا، ١٩٨٥.
فاروق حەفید زادە، شیعری فۆلکلۆری، ب١، سلێمانی، ١٩٨٢.
کاکەی فەللاح، کاروانی شیعری کوردی، ب١، بەغدا، ١٩٨٠.
کامیل بەسیر، شێخ نووری شێخ سالح، بەغدا، ١٩٨٠.
محەمەد ئەمین هەورامانی: فۆنەتیکی زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٧٤.
: سەرەتایەک لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٧٤.
: زاری زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٨١.
محمدی خاڵ، فەرهەنگی خاڵ، چ١، سلێمانی، ١٩٦٠.
٢- دیوان:
دیوانی ئەدیب سەیدیان.
دیوانی ئەحمەد موختار جاف، چ٢، هەولێر، ١٩٦٩.
دیوانی بێخود، محمدی مەلا کەریم، بەغدا، ١٩٧٠.





دیوانا پەرتوویێ هەکاری، صادق بهاءالدین، بەغدا، ١٩٧٨.
دیوانی تاهیر بەگ، سەیدیان.
دیوانی حاجی قادری کۆیی، سەردار حەمید میران، کەریم شارەزا، هەولێر، ٨٦.
دیوانی حەریق، محمود خاکی، چ٢، کەرکوک، ١٩٦٩.
دیوانی حەمدی، بەغدا، ١٩٥٧.
دیوانی زێوەر، بەغدا، ١٩٥٨.
دیوانی سالم، کوردی و مەریوانی، چ١، بەغدا، ١٩٣٣.
دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، چ٢، بەغدا، ١٩٤٦.
دیوانی صافی، چ٢، هەولێر، ١٩٦٥.
دیوانی قانیع، چ١، سلێمانی، ١٩٧٩.
دیوانی کەمالی، بەغدا، ١٩٨٦.
دیوانی کوردی، کوردی و مەریوانی، بەغدا، ١٩٣١.
دیوانی مەحوی، مەلا عەبدولکەریمی مدرس، محەمەدی مەلا کەریم، بەغدا، ١٩٧٠.
دیوانا مەلایێ جزیری، صادق بهاءالدین، چ١، بەغدا، ١٩٧٧.
دیوانی ئەدەب، بەشیر موشیر، بەغدا، ١٩٣٩.
دیوانی ناری، سەیدیان.
دیوانی نالی، مارف خەزنەدار، بەغدا، ١٩٧٧.
دیوانی وەفایی، محمد علی قەرەداغی، بەغدا، ١٩٧٨.
عەبدوڵڵا بەگی میسباح دیوان، مارف خەزنەدار، بەغدا، ١٩٧٠.
عەلی عارف ئاغا، گوڵ و خونچە، چ٢، سلێمانی، ١٩٨٥.
دیوانی مەولەوی، مەلا عەبدولکەریمی مدرس، بەغدا، ١٩٦١.
نوبهارا ئەحمەدی خانی، صادق بهاءالدین، چ١، بەغدا، ١٩٧٩.
٢- گۆڤار:
ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٠٩-١٩٨٦)، (١١٠-١٩٨٦)، (١١٣-١٩٨٧).
٣- ڕۆژنامە:
ئاسۆ، ١٦ی کانوونی یەکەمی، ١٩٨٩.
ژیان، ژمارە (٣٢-١٩٢٦)، (٣٣٦-١٩٣٢).

بەعەرەبی

١- كتێب:

ابراهيم انيس، الاصوات اللغوية، ط٣، القاهرة، ١٩٦١.

الارموي، الادوار، تحقيق هاشم الرجب بغداد، ١٩٨٠.

اليزابيث درو، الشعر كيف نفهمه ونتذوقه، ترجمة: محمد ابراهيم الشوش، بيروت، ١٩٦١.

أمين عبدالله، عروض الشعر العربي، ط١، القاهرة، ١٩٨٥.

اوفسيانيكوف، سمير نوفا، موجز تاريخ النظريات الجمالية، ط٢، بيروت، ١٩٧٩.

داود عبده، دراسات في علم اصوات العربية، مؤسسة الصباح.

سوسور، علم اللغة العام، ترجمة: يوئيل يوسف، ط٢، الموصل، ١٩٨٨.

غيورغي، غاتشف، الوعي والفن، ترجمة نوفل نيوف، الكويت، ١٩٩٠.

نعوم چومسكي، جوانب من نظرية النحو، ترجمة مرتضى جواد، الموصل، ١٩٨٥.

٢- دەسنووس:

سيد البحراوي، نحو علم للعروض المقارن، مقالة القيت في المؤتمر الثاني للرابطة العربية للادب المقارن، دمشق، ١٩٨٦.

دووەم: بۆ بەدەستهێنانی زانیاریی پتر لە بارەی بابەتەکانی باسەکەوە، خوێنەر دەتوانێت ئەم سەرچاوانەی خوارەوە ببینێت:

الفت كمال الروبي، نظرية الشعر عند الفلاسفة المسلمين، ط١، بيروت، ١٩٨٣، ص٢٣١-٢٦٥.

الاقلام، العدد (٥)، ١٩٩٠، ص٥٨-٦٩.

صفاء خلوصي، فن الترجمة، بغداد، ١٩٨٢، ص٢٥٤-٢٦٤.

موريس ابو ناضر، الالسنية والنقد الادبي، بيروت،١٩٧٩،ص٥-١٣.

الموسوعة الصغيرة، في نقد النثر وأساليبه، العدد (٢١٨)، ١٩٨٦، ص٨٣-٩٨.

Academic American Encyclopedia- 13, New Jersy, 1981, P: 343.